# له ستایشی فەلسەفەدا

***یاخود: هەڵنانی فەلسەفە***

***ئەرستۆتالیس***

**وەرگێڕانی**

**نەوزاد جەمال**



حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان
xaneywergeran@hotmail.com



- ناوی کتێب: لەستایشی فەلسەفەدا
- نووسەر: ئەرستۆتالیس
- وەرگێڕانی لە هۆڵەندییەوە: نەوزاد جەمال
- پیتچنین: نەوزاد جەمال
- دیزاینی ناوەڕۆک: زانا کەمال
- بەرگ : ئارام عەلی
- تیراژ: ٧٥٠
- زنجیرە: ٢٢١
- چاپخانە: کارۆ
- چاپ: چاپی یەکەم
- ژمارەی سپاردن: (٢١٨٥) ساڵی (٢٠٠٨)



# وتەیەکی پێویست

هەرچەندە ئەم کورتەنووسینەی فەیلەسوفی ناسراو ئەریستۆ لەبەر تێگەیشتن گران و ئالۆز نییە، بەڵام سەرەڕای سانایی نووسینەکە گرنگیەکی خۆی هەیە. ئەمە نەك تەنها لەبەرئەوەی کە بە شان و باڵی فەلسەفەدا هەڵدەدات، بەڵکو لەبەرئەوەی هەندێك تێزی نایابی لەخۆگرتووە کە باس لە ڕۆڵ و تێگەیشتنی فەلسەفە دەکات لە بۆ ژیانێکی بەختەوەرو پڕواتا کە شایانی لێخوردبوونەوە بێت.

کاتێك بۆ یەکەم جار ئەم تێکستەی ئەریستۆم خوێندنەوە بیرۆکەی وەرگێڕانی کەوتە خولیامەوە. گەرچی ئەریستۆ نووسینی دیکەی زۆر بەنرخی نووسیوە بەتایبەت لەسەر ئیتیك کە یەکێکە لەشاکارەکانی، بەڵام ئەم کورتەنووسینە تامێکی خۆی هەیە لەڕوونکردنەوەی واتای







فەلسەفە و ئەرکی لە ژیانی مرۆڤدا. لەبەرئەوە دەشێت وەرگێڕانی ئەم تێکستە بۆ سەر زمانی کوردی سەرەتایەك بێت بۆ ناسین و خۆشویستنی کارەکانی ئەریستۆ وەك چۆن دەروازەیەکیش بێت بۆ تێگەیشتن لە ناوەڕۆك و ئامانجی فەلسەفە.

هەموو مرۆڤێك هەر لە سروشتەوە حەزو خولیای زانستی هەیە. لەبەرئەمەشە کە ئەریستۆ ڕێنوێنیمان دەکات بۆ فەلسەفەکاری. فەلسەفە زانینی ڕاستیمان پێدەبەخشێت. لەم نووسراوەدا "لە ستایشی فەلسەفەدا" ئەریستۆ دەیسەلمێنێت کە تێگەیشتن و بەرچاوڕوونی فەلسەفی بەرزترین جۆری چاکەیە. چونکە بەهۆی ئەم تێگەیشتنەوە مرۆڤ ژیانێکی بەختەوەرو تەواو بەدەستدەهێنێت. لە ڕاستێدا هەر ئەمەشە سوودو کەڵکی فەلسەفە بۆ مرۆڤ. بەشێوەیەکی گشتی کارەکانی ئەریستۆ ستایلێکی زانستی تایبەتیان هەیە و تاڕادەیەکیش هێندە ئاسان نین لەبەر تێگەیشتن، بەڵام دڵنیام خوێنەر چێژێکی تایبەت لەم بەرهەمە وەردەگرێت، چونکو بەشێوەیەك نووسراوە کە بێ پێچ و پەنا گرنگی فەلسەفەمان بۆ دەردەخات.

دیارە لەبەرئەوەی لە زمانی کوردیدا تێکستێکمان نیە کە بەروونی واتاکنی فەلسەفە دەربخات. من لێرەدا خۆم بەستۆتەوە بە کرۆك و واتای سەرەکی تێکستەکەوە، گەر شتێك پێویستی بە ڕوونکردنەوە یا بە وشەیەکی زیاتر هەبووبێت، ئەوا خستوومەتە نێو کەوانەوە کە لەم شێوەیەدایە{}. ئیدی ئەوکەوانەی تر هی تێکستەکە یا هی وەرگێڕی هۆڵەندیە کە من وەك خۆی هێلاومەتەوە هیچ دەستکاریم نەکردووە. پاشان سەبارەت بە خاڵبەندی و ڕیزپەڕاندن هەروەك چۆن لە دەقە هۆڵەندیەکەدا هاتووە هێشتوومەتەوە.

دیارە ئەکرا لە هێندێك شوێندا زیاتر ڕوونکردنەوە و لێکدانەوە و ڕاڤەی هەندێك چەمك و زاراوەی فەلسەفی بکەم، بەلام لەبەر گەورەبوونی قەبارەو و زێتر ئالۆزی و سەرنەشێوان لەخوێنەری کورد کە لێکدانەوەی وەرگێڕو دەقەکە تێکەلاو نەکات، بە باشم زانی ڕاڤەو لێکدانەوەی بۆ دەرفەتێکی تر هەڵبگرم.

نەوزاد جەمال- وەرگێڕی کوردی








# پێشەکی وەرگێڕی هۆڵەندی

لە سەرجەم کارەکانی ئەریستۆ هەندێك دەستنووسی پەرتەوازە و پچرپچڕ بەجێ ماون کە تارادەیەك جێگای مشتومڕو گومانن لای شارەزایان. لەوانەش یەك ناونیشان کە تائێستاش دیارە ئەو نووسینانەیە کە بریتین لە دیالۆگ و چارەسەرو شیکردنەوە - تراکتاتۆس- بابەتی کۆکراوە.

سەبارەت بەو دیالۆگانەی کە لەسەر شێوەی دیالۆگەکانی پلاتۆ{مامۆستای ئەریستۆ} نووسراون چەند ناونیشانێك هەن وەك: سیمپۆزیوم، سۆفیست، گرایلۆس یاخود زمانپاراویی و ئیودەمموس-ڕۆح. یەکێك لەو تراکتانە دەربارەی چەمکی چاکەو ئایدیاکان و شوێنکەوتوانی پیتاگۆراس و دیمۆکریتوسە. وە یەکێك لەودەستە نووسینەی کە بزربوون ئەم نووسینە وەرگێڕدراوەیە بەناوی (Protrepticus) کە لەلایەن (W. D.Ross) وە

سەرجەمی نووسراوەکانی ئەریستۆ کۆکراوەتەوە و لە ژێر دیالۆگەکاندا ڕیزبەندکراون.

لەنێو ئەو نووسراوە پچڕپچڕانەدا شتێك بەدی ناکرێت کە وتوویژبێت لەنێوان دووکەس یا زیاتردا کرابێت، بەڵکو تێبینی ئەوە دەکرێت کەلەبنەڕەتدا دەقەکە دیالۆگ نییە، بەڵکو سەلماندێکی بەڵگەییە و وەك دەقێکی پۆلێمیکی {نووسینێکە کەتێیدا بەبەڵگەوە بانگەشە یا دژایەتی بۆچوونێك دەکرێت}. ئیدی لەمڕووەوە دەقەکە کاراکتەری دیالۆگێکی هەیە، ئەگینا بۆخۆی ستایلی دیالۆگی نییە{واتە بەو مەبەستە نەنووسراوە}.

بە شێوەیەکی گشتی دەقەکە بەمەبەستی دژایەتی و بەرپەرچدانەوەی ئیسۆکراتێس (٤٣٦- ٣٣٨.پ.ز.) نووسراوە. لە ئەوکاتەی ئەم دەقەی تێدا نووسراوە ئیسۆکراتێس وەك مامۆستاو نوسەرێکی زمانپاراوی بەناوبانگ بانگەشەی بۆ ڕیتۆریکا دەکرد وەك ڕاسترین و باشترین شێوازێ بۆ گەیشتن بە پێشکەوتنی کۆمەلأیەتی.

لەو سەردەمەی ئەم خەریك بوو لە ئەسینا، پلاتۆو ئەریستۆش خۆیان لەو مشتومڕەی دەربارەی باشترین








شێوازی

فێربوون وفێرگە هەڵقورتاند. لەو نووسراوەی کە بەناوی (Antidosis) کەلە دەوروبەری ٣٥٣ .پ.ز. بلأوکرایەوە، ئیسۆکراتێس بەرگریەکی تەواوی لە پرۆگرامی فێرگەکەی خۆی دەکرد و ڕەخنەشی لە فەلسەفەش دەگرت. بۆنموونە لە نووسینەکەی ئیسۆکراتێس کەدێینە سەری، شتێکمان لا دروستدەکات بەتایبەت لەچۆنییەتی مشتومڕەکە کەچۆن بەشداربووان لە وتووێژەکەدا پێشبڕکێی یەکتردەکەن. هەروەها بەوریاییەوە لەسەر پلەوپایەی سۆکرات و شوێنکەوتوانی قسەکراوە. وەك خۆی دەڵێت:

"بە وورياييەوە پێتدەڵێم گەر بەراوردێك لەنێوان ئەوانەی کە لافی سۆراخکردنی داوەری و ویژدان دەکەن بکەم، پرۆگرامی من لەهی هەموویان باوەڕپێکراوترو گونجاوترە، چونکو ئەوانی تر بانگەشە بۆ جۆرێك لە ڕەوشتبەرزی و بۆچوونێکی فەلسەفی دەکەن کە جگەلە لە خۆیان کەسێك تێی ناگات و هاوکات ئەو بۆچوونەش لەناوخۆیاندا مشتومڕاویە. لە کاتێکدا بۆچوونەکانی من

هاویەکە. بەلاّم ئەوان هەرئەوەندەیان بەلاوە بەسە گەر سەرکەوتووبن بەهۆی ناوبانگی خۆیانەوە، وە چەند فێرخوازێك بەلای خۆیاندا ڕابکێشن. بەلاّم من هەرگیز لەم ڕەوشتە تێناگەم گەر ڕۆژێك لە ڕۆژانیش تەنها یەك کەس بۆ فێریوون بێتەلام. مەبەستی من ئەوەیە کە کۆمەلّ بەگشتی بۆ ڕەفتارێك هانبدەم کە بەهۆیەوە ژیانیان باشتربێت و وە هێلێنەکانی-گریکەکانی- تریش لەو بێ دەرەتانییەی ئەمرۆکە ڕزگاربکەم (Antidosis,Isocrates;٨٤-٨٥).

ئەمە هۆکارێك بوو بۆ فەیلەسوفێکی وەك پلاتۆ کە دەبێت پارێزگاری لەفەلسەفە بکات. هەولّی ئەو بەتەنها بەوەوە نەوەستایەوە کە ئەو بڕیارەپێشوەختانەی کەوایاندەبینی فەلسەفە لە خزمەتی هیچ شتێکدانییە و بەشێکیش نییە لە ژیانی ڕاستەقینەی پیاوان. ئیدی پلاتۆ دووچاری هێرش وململانێ بووە لەگەلّ شاعیرو سۆفیستەکانداو کە هەریەکێکیان ڕێگەیان بۆ خۆیان خۆشدەکرد.هەر لەمێژەوە نەریتێك لەئارادابوو کە شاعیرەکان خۆیان وەك زمانحالّی ڕاستەقینەی خوداکان لە







ئامۆژگاریکردن و ڕێنیشاندانی خەلّکیدا نیشان بدەن. سۆفیستەکانیش دەیانویست لەڕێی وانە وتنەوە هەمان ڕۆلّیان هەبێت و لافیان بەسەر خوێندکارەکانیاندا لێدەدا کە دەیانخەنە سەر ڕێگای سەرکەوتن.

دیارە بەشێکی گەورەی کارەکانی پلاتۆ هەولێکە بۆ ئەوەی لە کۆنتێکستی ڕووناکبیری و کۆمەلاّیەتی و کولتوری سەردەمی خۆیدا جێگەیەك بۆ فەلسەفە بپچڕێت. بەدرێژایی ژیان ئەشکەنجە و ململانێی دژ بە فشوفیشالّی شاعیران و سۆفیستان چالاکیەکی کرنگی بینی. پلاتۆ بەهۆی نمایشکردنی سۆکراتەوە وەك فەیلەسوفێکی نموونەیی ویستی جەماوەرەکەی بکاتە شوێنکەوتووانی ژیانێکی فەلسەفی. لە (apologie) داکۆکیدا کە باس لە داکۆکیکردنەکەی سۆکرات دەکات و هەولّدەدات لە زاری مامۆستاکەیەوە بلّێت ژیان بەبێ پێداچوونەوەیەکی فەلسەفی هیچ بەهایەکی نییە: "ژیانێك بەبێ بیرکردنەوەی ڕەخنەیی ژیانێك نییە کەشایانی مرۆڤ بێت" (Plato; Apologie ٣٨a ٥).

گەرچی سۆکرات وەك نموونەیەکی بەرجەستەکردنی

ئەو ڕاستیە {ڕەخنەگرێکی فەلسەفی} هاتە مەیدانەوە، ئەپۆلۆجیەکەی پلاتۆ تەنها وەك پشتگیری و داکۆکیکردن لە سۆکرات ناخوێنرێتەوە، بەڵکو بۆخۆی وەك ستایشکردنێکی فەلسەفەشە. گەرچی ئەو پیاهەڵدانە بە فەلسەفەدا ژانرێکی ڕیتۆریکانەیە، وەك چۆن لای سۆفیستەکان هەمان شێوە بەکارهاتووە. بەڵام ئەم پیاداهەڵدانە وەك بابەتێك لای سۆفیستەکان بەشێوەیەکی دیکە کاری پێدەکرا. لەبەرئەوەی لای ئەوان کەسێك یاخود بابەتێك هەڵدەبژێردرا کەجێی پرسیاربوو. بەمەش دوو مەبەست هەبوو لە پشتیەوە: یەکەم بۆ ئەوەی بەهۆی بابەتێکەوە سەرنجی فێرخوازەکان لە داهاتودا بەلای خۆیاندا ڕابکێشن. وەلێ سەبارەت بە ڕاستگۆیی و دروستی بەلگەکانیان دەیانویست دەریخەن کە کەسێکی لاواز لە سەلماندندا، بەهێزتربکەن". بەپێی ئەفسانەکانی هێلێن ئەم شێوە بیرکردنەوەیە نەگبەتی هێنا بۆ گریگەکان، بەتایبەت لەپێناو ئەو جەنگەماڵوێرانکەرەدا دژ بە ترۆییەکان. چونکە ئەمە لە سەردەمێکدا بوو کە سۆفیستەکان لەبرەودا بوون، بەتایبەت سوارچاکێکی ئەو مەیدانە وەك گۆرگیاس و ئێسوکراتیس. بەلای لەبلەبانێکی







بیرتیژی وەك گۆرگیاس ئەم پێداهەڵدانە بۆخۆی مایەی کێبەرکێیەکە کە بیسەلمێنێت تاچەند باوەرپێکراو جێگای متمانە پێکردنە. هەروەها ئیسۆکراتیس وەك سەرکردەی فێرگەیەکی ڕیتۆریکی هاوکاریی بکات لەم لایەنەوە تاوەکو هونەری ڕیتۆریکی خۆی سەربخات و بیسەلمێنێت.

پاش مردنی سۆکرات ، فەلسەفە و سوکراتیش بوونە بابەتێکی رەخنەیی و پێداهەڵدان. لە پێناو پێدا هەڵدان و هەم ڕەخنەگرتنیشدا کۆمەڵێك پشتگیری یاخود ڕەخنە لەسەری نووسراون. هەروەها ئەپۆلۆجیەکەی پلاتۆش دەچێتە هەمان چوارچێوەوە. دەشێت ئەم کارە بەربەرەکانییەکی بۆ ڕەخنەگرانی فەلسەفەی پلاتۆ دروستکردبێت کە بەهۆیەوە هێرش بکەنە سەر سۆکرات. لە هەموو حاڵەتێکدا دەتوانین ئەپۆلۆجیەکە وەك پێداهەڵدانێك بەفەلسەفەدا بخوێنینەوە: بەتایبەتی سۆکرات تێیدا پێ لەسەر پرەنسیپەکانی خۆی دادەگرێت و بەرگری لە ڕەفتارەکانی خۆی دەکات.

بەڵام دەشبینیت کە پێداگرتن و خۆڕاگری خۆی بەمەرگ پاداشتی دەدرێتەوە! بۆیە دارشنەوەی بەرگریەکەی

سۆکرات جۆرێکە لە ئایدیالیزەکردنی ژیانێکی فەلسەفی کە سۆکرات سەرمەشقێکی نموونەییە! پۆرترێتی سۆکرات لە ئەپۆلۆجیدا نموونەییە، گەرچی ئەمە دوور لە بڕیاری حوکمدانی سۆکرات نووسراوەتەوە، بۆیە وەك بەرگرکردنێکی قانونی هیچ بەهاو واتایەکی ئەوتۆی نییە!

کاتێك سۆکرات لە ئەپۆلۆجیدا بەدواچونێکی فەلسەفی دەبەستێتەوە بەواتای ژیانەوە، بەوتەزایەکی ڕیتۆریکی – پۆلێمیکی ئەمە دەکات: لە ڕاستیدا ئەمە بۆچوونی پلاتۆیە لەو مشتومڕەدا دەربارەی باشترین شێوەی فێرکردن. ئەم بۆچوونە بەردەوام لە (Protrepticus)ی ئەریستۆدا دووبارە دەبێتەوە. ئەریستۆش بە شوێن پێهەلگرتنی پلاتۆ و هەم دژ بە ئێسۆکراتیس دەیەوێت ئەو بۆچوونە سەبارەت بە بەرگریکردن لەفەلسەفە دووپاتبکاتەوە کە فەلسەفە بەتەنها زانستێك نییە، بەڵکو لە مێژەوە وەك ژیانێك (فێربوونی ژیان) سەیرکراوە، چونکە سۆراخکردنی دانایی- فەلسەفە تەنها ڕێگایەکە بۆ گەیشتن بە بەختەوەری ژیان!

بۆیە کارێك کە تایبەتە بە ئامۆژگاریکردن سەبارەت بەوەی مرۆڤ چالاکییەکی وەك فەلسەفە پراکتیزەبکات پێی







دەوترێت پێداهەڵدان (Protreptikos) یاخود هاندان. وشەی هاندان بەو واتایە کە لە نووسینەکەی پلاتۆ (Euthydemus) دا هاتووە کە تێیدا سۆکرات بە سۆفیستێکی وەك ئێوتایدەموس و (Dionysodorus) دیۆنیسۆدۆرۆس (e.v ٣c٢٧٨.). سۆکرات دەیەوێت لەسەر بەڵێنەکانی بڕوات کە نمایشێك ئەنجام بدات دەربارەی هاندانی فەلسەفی (rotreptike sophia) : مەبەست لەمە ئەوەیە کە (Clinias) کلینیاسی لاو بۆ وەدەستخستنی ڕێزو ڕەوشتبەرزی هانبدات.

لەژێر سەرپەرشتی سۆکراتدا دواتر مرۆڤ دەگاتە گریمانەیەك: ڕەخنەی بێ زانست و زانین بوونی نییە! ئەو زانینەش کاتێك بەشداری دروستکردنی بەختەوەری دەکات کە نەبێتە سەرمایەیەکی مردوو، بەڵکو بناغەیەك بێت بۆ کردەوەکان. بەهەمان شێوەش دەبێت دارتاشێك تەنها ئیش بەکەرەسەو ئامێرەکانی بەردەستی نەدەکات، بەڵکو دەبێت باش بەکاریان بهێنێت. هەمان بۆچوونیش لە لاپەڕە ٧٩ ی (Protrepticus)ی ئەریستۆدا دووبارە دەبێتەوە. لەوێدا ئەو جیاوازییەك لەنێوان ئەو بەهرەیەی کە لەمرۆڤدا هەیە

لەگەڵ ئەوەی کە دەگونجێت بەزانین و زانست بژمێردرێت.

زاراوەی *پرۆترێپتیکوس لۆگۆس* بۆ نووسینێکی تایبەت بەکاردێت کە ڕێنوێنی مرۆڤەکات بەرەو پراکتیزەکردنی فەلسەفە، بەهەمان شێوەش لەلایەن چەندین کەسی دیکەوە لەم جۆرە نووسراوەی ئەرستۆ هەیە وەك بۆنمونە: Aristippus, Epicurus, Cleanthes, Chrysipurs, Posidonius, Cicero. یەکێك لەو دەستنووسە پارێزراوانەش پرۆترێپتیکوسی پلاتۆنیزمی نوێیە Iamblichus Chalias(ca. ٢٤٠-٣٢٠).

ئیامبلیکوس دەستنووسەکەی وەك نموونەیەك بۆ چاولێکردنی زۆربەی تێکستە بزربووەکەی ئەریستۆی بەکارهێناوە و ویستویەتی دایبڕێژێتەوە، بەڵام لەسەر زمانی ئیامبلیکوس. شایانی باسە ئەم دارشتنەوەیە بەهۆی دوو هۆکارەوە بارگرانتر بووە. چونکە ئیامبلیکوس خووی وابوو کە دیالۆگەکانی پلاتۆ بەپێی پەرتووکێك بنووسێتەوە کە لە شێوەی چارەسەرکردنێکدا بێت. جا ئاخۆ ئەم جۆرە کارەی لەسەر پرۆترێپتیکوسی ئەریستۆ چەسپاند یا نا، ئەمە بەباشی دیار نییە.








پاشان لەکارەکەی ئیامبلیکوس دا چەند دژبەیەکیەکی *ستێریۆتایپ* ئامێزی وەك ڕۆح \جەستە، بالآیی و نزمی، واتە ئەو بۆچوونانەی وەك لە ئاستێکی بڵند و بەرزدا خۆیان دەبیننەوە. بۆ ئێمە ئاسان نییە کە ئەو شێوازە ڕیتۆریکیەی ئیامبلیکوس وەك ستایلێکی خۆی بژمێرن یا نا. لەهەموو حاڵەتێکدا ناتوانین ئەو خەسڵەتە بدەینە پاڵ تێکستەکەی ئەریستۆ کە ڕاستەوخۆ لە ژێر کاریگەری پلاتۆدایە!

چونکە دەشێت ڕاست نەبێت کە لە ڕێی بیرکردنەوەکانی پلاتۆوە ئەنجامگیری ئەوە بکەین کە دەقەکەی ئەریستۆ لەسەردەمی لاوێتیدا نوسرابێت. گەر لەو ڕوانگەی پیداهەڵدان بەژیانی فەلسەفیەوە سەیری کارەکانی ئەریستۆ بکەین، ئەوا سەرلەبەری ژیانی ئەو پلاتۆنی بووە و تاڕادەیەکیش ئەریستۆ کەمتر لە مامۆستاکەی بایەخی بە مەسەلە سیاسیەکانی سەردەمی خۆی داوە. هەروەها ئەو بۆچوونەی کەپێی وایە بیروهزری ئەریستۆ تەواو لەژێر کاریگەری پلاتۆ جیا ناکرێتەوە، تاڕادەیەك بەهێزنییە. بەڵام گەشەکردنێکی باش لە ژیان و کارەکانی ئەریستۆدا تێبینی

دەکرێــت، گەرچــی لەهــەمان کاتــدا قورســایی کاریگــەری مامۆستاکەشی پێوە دیاربێت!

کۆرنێلس فێرهۆڤن Cornelis Verhoeven





----------------------------------------

# له ستایشی فه‌لسه‌فه‌دا

**یاخود: *هه‌ڵنانی فه‌لسه‌فه***

***ئه‌ریستۆتێلس***

**Aristoteles *Protrepticus*؛**

----------------------------------------







## ڕۆح و به‌خته‌وه‌ری

**١**

**﴿ئه‌ریستۆ ده‌قی "له ستایشی فه‌لسه‌فه‌دا" پێشکه‌ش به (Themison)شای قوبرس ده‌کات.[1] له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا پێشنیازده‌کات﴾ که تا ئێستا بۆ هیچ که‌سێك هه‌ڵنه‌که‌وتووه پێداویستیه سه‌ره‌کیه‌کانی له‌به‌رده‌ستدابێت تاوه‌کو خۆی بۆ فه‌لسه‌فه ته‌رخانبکات. به‌لاّم ئه‌و (شای قوبرس) هۆکارێکی –ڕێگایه‌کی زۆری له‌به‌رده‌م دابوو تاوه‌کو به‌باشی بتوانێت به‌وکاره هه‌ڵبسێت. هه‌روه‌ها ئه‌و بیرکردنه‌وه‌یه‌کی به‌رزیشی هه‌بوو.**

---

[1] پێده‌چێت لێره‌دا ئه‌ریستۆ بیه‌وێت ئه‌و تێزه پلاتۆنییه‌ی که شافه‌یله‌سوفه به‌ورییایه‌وه به‌کاربهێنێت بۆ ئه‌وه‌ی پشتگیری ماددی و ده‌سه‌لاّت پێکه‌وه گرێچ بدات.

## ٢

﴿ ئەوانـــەی بـــەدوای بەختـــەوەری لـــە هـــەبوونی {کەرەسـەی}ماددیـدا دەگـەڕێن، شکـست دەهێـنن: چـونکە بارودۆخەکـەیان﴾ وایـان لێـدەکات کـە دەبێـت هەڵبـژێرێك بکـەن لـە نێوانیانیانـدا {شـتەماددیەکاندا} و هـەم ئـەوەش بکەن کـە لەسـەریانە بـۆکردن. بۆیـە دەبێـت مـرۆڤ هـەردەم چاوی لەو دۆخە ناخۆش و ناشادکەرانەیش بێت کـە بەسـەر کەسێکی وەهادا{ئـەوەی بەختـەوەری لـە شـتە ماددیەکانـدا دەبینێتەوە} دێت، وە دەبێت خۆی لەو دۆخـە ڕزگاربکـات و تێشبگات کە بەختەوەری لەوەدا نییە مرۆڤ بـەدوای سـامانی ماددیـدا بگـەڕێت. بـەڵکو بەختـەوەری لەوەدایـە کـە ڕۆحـی ئـادەمی ڕەحـەت بێـت.[2] هـیچ کەسـێك ناتوانێـت لافـی ئـەوە لێبدات کە جەسـتە مایـەی بەختەوەریـە، هـەر لەبەرئـەوەی کـە جەسـتەی بـە بـەرگ و کاڵایـەکی جوانــەوە ڕازاوەتــەوە،

[2] ئەرکی خۆی وا دەبینێت کەدانیشتوانی ئەسینا قایل بکات کە ئـەوان خـەمی ڕۆحـی خۆیـان بخۆن، چـونکە خـەمخواردنی ڕۆح مـرۆڤ دەباتـە پلەیـەکی بـەرزەوە. دا2b30 سۆکرات لـە ئەپۆلۆجی پلاتۆ لەسەردێڕی








بـەڵکو لەبەرئـەوەی سـاغ و دروسـتەو لـە دۆخێکـی باشـدایە، گەرچی جەستەشی ناپۆشتەو ڕووتیش بێت.

بەهەمان شێوەش دەبێت بیر لە ڕۆحت بکەیتەوە. تـۆ یـا هـەموو مرۆڤێـك دەتوانێـت ڕۆحـی خـۆی بـە فێرکـردن و خوێندنێکی باش بەختەوەر بکات: نەك بـەوەی کـە ڕواڵـەت وڕووخـــسارێکی زۆر شۆخوشـــەنگی هـــەبێت کـــە هـــیچ سودوکەڵکیشی نەبێت. وەك چـۆن بەلامانـەوە ئەسـپێك زۆر بـــەنرخ نییـــە گەرچـــی ڕەشمێکـــی زێـــڕینیش و زینێکـــی گرانبەهاشی پێوەبێت، لەبەرئـەوەی گوێڕایـەڵ نییـە. بـەڵام گــەر حــاڵی بــاش بــوو{گوێڕایــەڵ بــوو} ئەوســاکە بــەرز دەینرخێنین.

## ٣

سەرەڕای ئەوەی خەڵکانێك زۆرجار کە هـیچ سـوودێکیان نییـە و دەبنـە سامانـدار، بەمەش زۆر بایـەخ بـەو بـەهاو بـەو شـتانە دەدەن کەموڵکیانـە، نـەك سـامانە ڕۆحیـەکان. ئیـدی هیچ لەمە شەرمەزارتر نییە لـە ژیانـدا، بۆنموونـە هـەروەك چۆن کەسێك دەبێتە مایەی گاڵتەجاڕی بەهۆی ئەوەی خۆی

لە یەکێك لە بەندوکۆیلەکانی کەمترە، بەهەمان شێوەش دەبێت ئەوانەی سامانی ماددی گەورەترە لە خودی سروشتیان، کەمتر دەبێت، بە ماکامەران و نابەختەوەر بژمێردرێن.

4

لەڕاستیدا ئەمە وایە، چونکە زۆر هەبوون(سامان زۆری) هۆکارێکە بۆ سەرکێشی و زیادەڕەووی، وەك پەندەکە دەڵێت. هەروەها کاتێك نەزانی ونەخوێندن هاوشان دەبێت لەگەڵ دەسەڵات و هێزدا، ئەوساکە ئەمەش سەرلێشێواویی وشێتی لەدایك دەبێت، وە ئەوانەی ڕۆحێکی نادروست و ناجۆریان هەیە، هیچ قازانجێك لە سامان و هێزو جوانی ناکەن.

بەڵام تاچەند مرۆڤ ئەم خەسڵەتانە{هێز،سامان، جوانی}ئەوەندە زیانی بۆخاوەنەکەی هەیە، بێئەوەشی بەخۆی بزانێت. وەك دەوترێت "چەقۆ(خەنجەر نادرێتە دەست منداڵ)": واتە هەرگیز نابێت دەسەڵات بخرێتە دەستی کەسی ساویلکەوە.







5

سەبارەت بە تێگەیشتن دەشێت هەموو یەکێك هاوڕابێت کە تێگەشتن لە بەرئەنجامی ئامادەیی فێربوون و گەڕان بەدوای ئەوەی پێویستە بۆ وەدەستخستنی فەلسەفەدایە. بۆیە هیچ بەهانەیەك نامێنێتەوە بۆئەوەی چیدیکە مرۆڤ بەدوای خوێندنی فەلسەفە نەکەوێ.

## خوێندنی فەلسەفە

6

لە دوو حاڵەتدا مرۆڤ باس لە خوێندنی فەلسەفەدەکات: کاتێك کە مرۆڤ دەیەوێت بزانێت ئایاکو خویندنی فەلسەفە پێویست نییە. هەروەها ئەو دەمەی مرۆڤ خۆی بە تەواوی بۆ فەلسەفە تەرخاندەکات.[2]

[2] بەواتایەکی فراوانتر "فەلسەفە" لێرەدا هەموو شێوازێکی ڕوناکبیری دەگرێتەوە. بەمانایەی پلاتۆ لەکۆماردا لە سەردێڕی (٤٧٥) دا مرۆڤی فێرخواز وەك فەیلەسوف ناوزەد دەکات. ئیدی باسکردنی لە ڕۆڵی ڕوناکبیری و کۆمەڵایەتی فەلسەفە بۆخۆی بەشێکە لە فەلسەفە ولە هەمان کاتدا هۆکارێکە بۆ خوێندنی. دەشێت ئەمە وەڵامێکی بەرگریکارانە بێت سەبارەت بە ستایشکردنی فەلسەفە. بەمانایەکی تایبەت فەلسەفە بریتیە لە بۆچوون و تێگەیشتن لە پرەنسیپە یەکەمینەکان.

## 7

﴿لەبەرئەوەی ئێمە ڕووی دەممان لە مرۆڤە نەك ئەوانەی کاراکتەر{کەسێتی}خودایان هەیە، دەبێت ئەو هەڵنان وئامۆژگاریانە{سەبارەت بەخوێندنی فەلسەفە} لەگەڵ هێڵە سەرەکیەکانی ڕۆڵی کۆمەڵایەتی ژیانی پراکتیکی فەلسەفە بگونجێنین. بابێینە سەر ئەم خاڵە﴾

## ٨

﴿ئەوەی لەبەردەمان دایە بۆ ژیان بۆنموونە لاشەو ئەوەی پەیوەندیان پێوەیەتی، دەتوانین وەك ئامێرێك، ئامرازێك سەیری بکەین. ئیدی بەکارهێنانی ئەم ئامرازە جۆرە ڕیسکێك لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. بەتایبەت بۆ ئەوانەی کە بەشێوەیەکی دروست ئەو ئامرازە بەکار ناهێنن، ئاکامی خراپی لێدەکەوێتەوە، لەبەرئەوە دەبێت بەدوای زانستێك دا بگەڕێین بۆئەوەی هاوکاریمان بکات لەو بوارەدا تاوەکو بتوانین بەشێوەیەکی دروست ڕێکیانبخەین. ئیدی دەبێت بەدوای ئەو زانینەدا بگەڕێین و بەشێوەیەکی








دروست بەکاری بهێنین. لەبەرئەوە دەبێت فەلسەفە بخوێنین تاوەکو بتوانین بەشێوەیەکی دروست لە کۆمەڵدا هەڵسوکەوت بکەین﴾

## ٩

ئیدی ئێستا چەند شێوەیەکی جیاوازی زانست لە ئارادا هەیە: یەکێك لەوانە ئەو زانستەیە کە لە ژیاندا سوودو کەڵکێکمان پێ بگەیەنێت. ئەویتریش ئەو انستەیە کە خەڵکی بەکاری دەهێنن. کەواتە چەند جۆرێك لە زانست هەیە کە هەریەکەی بۆ مەبەست و شتێك بەکاردەهێنرێت. وە ئەوانەشی ڕێنمایکەرو ڕێنیشاندەرن. گەرچی جۆری دووهەمیان باڵادەسترە، بەڵام چاکە بەمانایەکی دیاریکراو دەگەڕێتەوە بۆ هەردووکیان{هەردوجۆرەکە}. دەی کەوابێت تەنها زانستێك هەیە کە بتوانێت بڕیارێکی دروست پێکبهێنێت و هەروها ئەقڵ و هەموو لایەنەکانی چاکە لەبەرچاو دەگرێت - وە فەلسەفە شێوازێکە لە زانست و زانین- کەدەتوانین هەموو شێوەکانی تری زانین بەکاربهێنین و ڕێنوێنیش بکات بێئەوەی پێچەوانەی

سروشـــتی مـــرۆڤ بێتـــەوە، لەبەرئـــەوە دەبێـــت لەهـــەموو حاڵەتێکدا فەلسەفە بخوێنرێت. چونکە بەتەنها فەلسەفە دروسترین بڕیاری لایە، هەم تێگەیشتنێك دەبەخشێت کە هیچ هەڵەو خەوشێکی تێدانییە.[2]

## سروشت و بوون

١٠

﴿با لەخاڵێکەوە دەست پێبکەین ئەویش مەبەست و ئامانجی سروشتە، وەلەوێشەوە بگەینە هەمان ئامۆژگاری﴾

١١

ئەوشـــتانەی کەهـــەن لەهەنـــدێك حاڵەتـــدا بوونیـــان دەرئـــەنجامی هەنـــدێك مەبەســـت وکارامـــەیی و لێهـــاتوویی مرۆڤـە، بۆنموونـە خـانوو یـاخود کەشـتیەك. هـەردووکیان {خانوو و کەشتیەکە} بەرئەنجامی یاخود بەهۆی کارامەیی

[1] Aristoteles: *Metaphisica*; I,2 (982a18-30)





و وەســـــتاییەکی تایبـــــەت و پلانێکـــــەوە هاتوونەتـــــە بوون(دروستکردن). بەڵام شتگەلێکی دیکە هەن کەبوونیان وابەســـتەی کارامـــەیی و لێهـــاتوویی نییـــە، بـــەڵکو بـــەهۆی سروشتی خۆیانەوەیە. هۆکاری بوونی گیانلەبەران و ڕووەك دەگەڕێتەوە بۆ سروشت و ئەو بابەتانەی لەم جۆرەشن بە کردەیەکی سروشتی هەن. بەڵام چەند شتێکی دیکە هەیە کەبەڕێکـــەوت هاتوونەتـــە بـــوون. ســـەبارەت بەزۆربـــەی ئەوشتانەی کە بەهۆی پرۆسەیەکی سروشتی و هەروەها بـــەهۆی هۆکارێکـــەوە هـــەن، دەتـــوانین بڵـــێین کـــە بوونیـــان بەرهەمی ڕێکەوتە.

١٢

ئەوشـــتانەی کەبەڕێکـــەوت هاتوونەتـــە بـــوون بـــەهیچ شـــێوەیەك مەبەســـتێکی دیـــاریکراو و هـــیچ ئامـــانج و چارەنوسێکی نییە. بەڵام ئەوانەی کە بەرهەمی دەستکرد و لێهاتووین هەم مەبەست و هەم ئامانجێکی تێدا بەدی دەکرێ. کێ کارامەیی و لێهاتوویيەکی هەبێت، هەمیشە





دەتـوانێ هۆیـەك، پاسـاوێك بهێنێتـەوە کەبۆچـی شـتێك دەنوسێت و بەهۆیشیەوە چ مەبەستێك دەپێكێت. ئیدی ئەم مەبەستە باشترە لەوەی مرۆڤ داخۆ بەهۆی ئەوکارەی چاوی لەچی بڕیوە. مـن مەبەسـتم لـەو شـتانەیە کـە کارامـەیی هۆکارێکی سەرەکیە لەدروستبوونیان، نەك لاوەکیـە. لێـرەوە دەتـوانین پزیـشکی وەك هۆکارێـك بـۆ تەندروسـتی دابنـێین وەك لەوەی بە هۆکاری ناساغی بژمێرین. بەهەمان شێوەش هونەری بیناسازی هۆکارێکە بۆ سازکردنی خانوویـەك نـەك بۆ ڕووخاندنی.

بـەم شـێوەیە دەبیـنین کـە هەرشـتێك بـەپێی یاسـاکانی کارامـەیی وەسـتایی و کـارزانی بێتـە دی-بـوون- ئـەوا بـوونی ئەو شتە مەبەستێکی دیاریکراوی هەیە: ئـەویش چارەنوس و ئامانجە تێیـدا. وە ئـەو ئامانجـەش بـەرزترین شـتە. بـەڵام ئەوەی بەرێکەوت دروستبێت، بەهۆی مەبەست و ئامانجێکی دیـاریکراو و تایبـەتبوون. وەڵێ دەشـێت بەرێکـەوت شـتێکی باش دروستبێت، بەڵام ئەوە شتێکی باش نییـە لەبەرئـەوەی کە بەرێکەوت دروستبووە. ئیدی ئەوەی بـەهۆی ڕێکەوتـەوە







دروستدەبێت هەمیشە شتێکی، هەبوونێکی نادیاریکراوە.[3]

## ١٣

لەو نێوەندەشدا شـتێك کـە بەرێگایـەکی سروشـتی دێتـە بـوون، مەبەسـتێکی دیـاریکراوی تێـدا هەیـە، وە هەمیـشە فۆرمێـك وەردەگرێـت کـە لـە پێنـاو مەبەسـتێکی بـاڵاو بەرزتردایـە، نـەك لەبەرئـەوەی بـەروبوومی —بەرهـەمی- کارامـەیی مـرۆڤ بێـت.[4] لەبەرئـەوەی ئـەوە سروشـت نییـە کەلاسـایی کارامەییـەك دەکاتـەوە، بـەڵکو بەپێـچەوانەوە ڕاسـتە. وە کارامـەیی لـەپێناو دیـاریکردنی سروشـتدایە و هاوکارە لە پڕکردنەوەی گشت کەموکورتیـەکانی سروشـت.[5]

---

[3] Arisotitels: *Phisica*, II,5(197a 5-11).[2]

[4] ئەریـستۆ لـە Caelo I،٤ (271a33) دەڵێـت خـواو سروشـت هـیچ شـتێك لـەخۆڕا ناکەن. پێش ئەریستۆ لیوکیپووس Leucippus هەمان بنـەمای وتـوە: "هـیچ شـتێك لەخۆڕا ڕوونادات، بەپێچەوانەوە هـەموو کەسێك لەسـەر بنـەمای ئاوەزوئـەقڵ هـەم زەرورەت دەڕوات بەرێوە":. Diels& Kranz, Die Fragment, Fr.67 B2.

[5] کۆنتێکستی چـەمکی "بـاڵا" یـاخود بـەرزو "نـزم"ڕەتدەکاتـەوە کەلاسایکرنەوە-لەسـەر دروسـتکردنەوە-لاسـایکردنەوەیەکی میکـانیکی نییـە، بـەڵکو جـۆرە ویـست وحەزێك تییێدا ئامادەیە: چونکە هەوڵێکە بۆ گەیـشتن بـە هـەمان شـت وەك خـۆی ،

پێدەچێت هەندێك شت لە سروشتدا تەنها بەهێزی خۆی بێ هاوكاری{دەرەكی}دروستبێت، لەكاتێكدا سروشت زۆر بەسەخڵەتی یاخود هەر ناتوانێت ئەو كارە ئەنجام بدات.

ئەمەش بەئاشكرا لە پرۆسەكانی دروستكردن و گەشەكردندا دەردەكەوێت: هەندێك تۆو گەشەدەكەن{بەروبومیان دەبێت} بەبێ هیچ هاوكاریەك و بێگوێدانە هیچ خاك وزەویەك لەهەرشوێنێك بێت ئەو تۆوانە دەبنە بەروبووم. لەكاتێكدا هەندێك بۆ ئەوە پێویستی بە كارامەیی هەیە {وەك كشتیاروجوتیار}، بەهەمان شێوەش هەندێك گیانلەبەر بەهێزوتوانای خۆیان گەشەدەكەن، لەكاتێكدا مرۆڤ بۆ دابینكردنی ژیانی چەندین كارامەیی و كارزانی پێویستە بۆ خۆراك {پەیداكردن}كەهەر لەقۆناغی لەدایكبوونەوە دەستپێدەكات تا كۆتایی ژیانی.

تەنانەت گەیشتن بە ئاستێكی بەرزتر: Arisoteles; *Politica* VII,17(133a 1-3)







## ١٤

ئیدی گەر كارامەیی مرۆڤ لاسایكردنەوەی سروشت بێت، ئەوا كارامەیی بۆخۆی چەند خەسڵەتێكی هەیە كە لەپرۆسەی دروستبوونی هەموو شتێكدا چاوی بڕیوەتە شتێك{بەمەبەستێك}. دەتوانین گریمانەیەك بكەین كە ئەوشتەی بە شێوەیەكی ئاسایی دێتەبوون، ئەوا بەهۆی مەبەستێكی دیاریكراو دێتە دروستبوون. وەئەوەش كە بەڕێگایەكی باش دروستدەبێت، ئەوا هەر بەشێویەكی ئاسایش دێتە بوون. وە ئەوەشی كە هەیە یاخود دێتە بوون باشە بەلانی كەمەوە كاتێك پابەندی پرۆسەیەكی سروشتی دەبێت. ئەوەشی دژ بەسروشتە، ئەوە باش نییە و ناكۆكە لەتەك ئەوەی كە سروشتیە.

## ١٥

لێرەدا دەگەینە ئەنجامێك: هەبوونی سروشتی ئەوەیە

کـە بەمەبەسـتێکی دیـاریکراو بێتـەبوون. ئـەم ڕاسـتیەش بەتایبـەتی لـە ئەندامـەکانی جەسـتەی خۆمانـدا بەباشـی دەبینرێت. بۆنموونە گەر هاتوو بـە سـەرنجێکی ووردەوە لـە پێڵـوەکنی چـاوان بـڕوانین، دەردەکـەوێت کـە هـەر لـەخۆوە دروست نەبووە، بـەڵکو بـۆ پارێزگاریکردنـە لەچاوەکانمان و هـەروەها بـۆ ئـەوەی پـشوو بـە چـاو بـدات تـا شـتێکی تێنەکەوێت.[4]

لێرەدا مەبەستمان لە هاتنـەبوون و دروسـتبوون ئەوەیـە کـە شـتێك لـە پێنـاو مەبەسـتێکی دیـاریکراودا دروسـتبووە. بۆنموونــە کاتێــك کەشــتیەکی بارهــەڵگر دروســتدەکرێت بەمەبەستی گواستنەوەی ئـاویی. ئیـدی هـەر لـە پێنـاو ئـەو مەبەستەشدا دروستکراوە.

**١٦**

[4]لە "یاداشتەکان دەربارەی سۆکرات" زینیچفۆن ئەوە دەدرکێنێت کە پێکهاتەی پێڵوەکانی چاو وەڵامی ئەو مەبەستانەیە کـەلێرەدا باسـکرا، هـەروەها ئـەو ئامـانج و وەڵامم دەبەستێتەوە بەچەمکی ئاکامەندی هوشیاریەوە، *سەیری:*
Xenophon, *Herrineringen aan Socrates* I,4,5. Aristoteles *De anima* II, 9(421 b 29-32).







گیانلەبــەرەکان و زینــدەوەران هــەر هــەموویان ســەربەو شـتەن کـە بەڕێگایـەکی سروشـتی یـاخود دروسـتکردنیان هاوکۆکـە لەگـەڵ سروشـتدا، یـاخود لـە هـەموو حاڵەتێکـدا باشترین و بـە بـەهاترین زینـدەوەرن. لەوبارەیـشەوە ڕایـەك هەیـە کـە زۆربـەی شـتەکان بەپێـچەوانەوەی سروشـتەوە دروسـتبوون و هـەر لـە پێنـاو لـەناوبردن و زیـان گەیانـدن هاتوونەتەئاراوە، نەك سەرلەبەر تێکشکاندن.[4]

کەواتە بە بەهاترین گیانلەبەر لەسـەر زەویـدا مرۆڤـە.[5] ئاشکراشە کە بوونی مرۆڤ بەڕێگایەکی سروشتی و هاوکۆکە بە سروشت".

**١٧**

ئیدی گەر لە هەموو شـتەکاندا ئامـانج و چـارەنووس لـە خودی شتەکە گرنگتربێت (چونکە هـەموو شـتێك کـە هەیـە

[4] سـەرەڕای گینلەبـەرە زیانبەخـشەکانیش دەبێـت ئـەو ململانـی٘و شـەڕنگێزیەی لەنێوان گیانەوەرانیشدا لەپێناو مانو ژیاندا لەبەرچاوبگرین:.
VI(11u1a21-22)

[5] Xenophon, *Herinneringen aan Socrates* I, 4, 14 & vgl. Aristoteles, *Ethica Nicomachea* VII (1141a21-22).

بەهۆی ئامانجێکەوە دێتەبوون، وە خودی مەبەستەکە لەبوونی شتەکە خۆی باشترە، بەڵکو لە هەموو شتێك باشتریشە)، وە ئەگەر ئامانجی دیکەش لەگەڵ سروشتدا هاوکۆك بێت، بەتایبەت لەوەدا کە لە پرۆسەی هاتنەبوونەکەدا بەدەستدێت، بەمەرجێك پرۆسەکە پچڕپچڕش نەبێت، وە ئەگەر ئەمە وابێت کە کاتێك لاشە گەشەکردنی لە پێناوی ئەوەی کەدروستکراوە بۆی تەواودەکات. بەهەمان شێوە ئەمە بۆ ڕۆحیش ڕاستە. ئیدی ئەمە لە هەموو ڕوویەکەوە باشترە کاتێك کەدواتر دێت نەك لە دەمی هەبووندا{واتە پاش ئەوەی دروستدەبێت باشترە لە بوونەکە}، وە ئەگەر وابێت کە ڕۆح پاش جەستە دێت، وە ئەوەش کە لە ڕۆحەوە دێتە بوون تێگەیشتنە کەدواتر دێت (چونکە دەبینین کە تێگەیشتن هەر لە سروشتەوە لە قۆناغێکی دواتردا گەشە دەکات، وە لەبەر ئەوەشە کە مرۆڤ لەتەمەنی گەورەییدا پشتی پێدەبەستێت)، پاشان تێگەشتن و کامڵبوون جگەلە ئامانجی سروشتی و وەدەستخستنی دونیابینی چیدیکە نییە کەدواجار ئەمە ئەو مەبەست و نیازەیە کە ئێمە لە







پێناویدا هەین. وە ئەگەر ئێمە بەڕاستی هەبین، ئەوا مەبەست لە بوونمان وەدەستخستنی تێگەشتن و فێربوونە.

## ١٨

ئەوە چییە کە لەهەموو ئەو شتانەی کەهەن کە چ سروشتی و هەم بەهۆی یەزدانەوە ئێمەی هێناوەتە بوون؟ کاتێك ئەم پرسیارە لە پیتاگۆراس کراو وتی: " بۆئەوەی بە سەرنجەوە بڕوانینە ئاسمان". هەروەها ئەو لەبارەی خۆیەوە بەئاسایی وتویەتی کە بوونی وەك پشکنەرێکە کە سروشت بووەو هەر لەو پێناوەشدا هاتۆتە جیهان.[4]

## ١٩

[4] ئەو بەسەرهاتەی کە دەڵێت فەیلەسوفەکان خاوەنی بیرکردنەوەیەکی پەرتەوازەو نامۆن و هەر لە ئاسمان دەڕوانن، تالیس دەگرێتەوە، کە کاتێك {لە ئەنجامی بیرکردنەوەدا} کەوتۆتە چاڵێکەوە، سەیری(Plato, *Theaetetus* 174a) ، کە بۆخۆی بۆتە ستێریۆتایپێکی باو سەبارەت بە فەیلەسوفەکان . ناوی پیتاگۆراس کە لێرەدا هاتووە، لە شوێنی کەدا باسنەکراوە. ئیایمبلیکوس دەیەوێت لەسەر زاری پیتاگۆراس بڵێت سەیرکردنی ئاسمان و ڕێکوپێکی ناوی چەند جوانە( *Leven van Phtagoras* XII, 59).

هەموو ئەو چیرۆکانەی سەبارەت بە ئەناکسۆراس هەیە، کە کاتێك پرسیاری لێکراوە ئایاکو مرۆڤ بە چ مەبەستێك لەدایك بووەو بە چ مەبەستێکیش دەبێت بژی، لە وەڵامدا وتوویەتی: "بۆ ئەوەی بەووردییایەوە سەیری ئاسمان و هەم ئەستێرەکانیش و مانگ و خۆر بکەم"، چونکە بەلای ئەوەوە شتەکانی دیکە گرنگ نین.[5]

٢٠

بەم پێیە بێت پیتاگۆراس ڕاستدەکات کە هەموو مرۆڤێك لەلایەن خوداوە بۆئەوە دروستکراوە کە زانست وەدەستبخات و خۆی بۆ بیرکردنەوە تەرخان بکات. ئینجا ناوەڕۆك و بابەتی ئەو زانیاریە پشکنینی ڕێکوپێکی جیهان بێت، نەك شتێکی سروشتی لەسەر زەویدا، ئەوا باشترە دواتر لەسەری بدوێین. ئەوەی کە ئێمە لێرەدا ووتمان بەشێویەکی تەواو بەسە. ئیدی گەر دونیابینی فەلسەفی ئامانجی سروشتی بوونی ئێمە بێت، ئەوا دەبێت تێگەیشتن

5 Diels& Kranz, *Die Fragmente*, fr. 49 A30 en vgl. Aristoteles, *Ehtica Eudemia* I, 5 (1216 a 11).





لە هەموو شتەکان بەرزترین پایەی هەبێت.

٢١

لێرەوە دەگەینە ئەنجامێك: کە دەبێت مرۆڤ شتێکی دیکە بکات لە پێناو ئەو خەسڵەتە باشانەی کە تێیدایە و وە لەوانەش شتە جەستەییەکانی لە پێناو ئەو ڕۆحەدا بەکاربهێنێت، هەروەها جۆرێتی مۆراڵیش لە پێناو تێگەیشتن بەکاربهێنێت ، چونکە ئەمە لەسەروو گشت شتێکەوەیە.

## توانای بیرکردنەوەو ڕێکوپێکی سروشتی

٢٢

هەمان ئامانج دەمانگەیەنێتە هەمان دەرئەنجامی ئەم





ڕاستیەی خوارەوە

## ٢٣

لەبەرئەوەی لە سروشتدا جۆرێك لە ئەقڵیەتی ڕێکخستن-ڕێکوپێکی هەیە، بۆیەکا ئەو سروشتە هیچ شتێکی سەربەخۆو نارێك ناکات، بە ڵکو هەمووشتێك تێیدا بەمەبستێك ئەنجام دەدرێت. وە بۆئەوەی کردەی مەبەستدار لە کردەی ڕەمەکی و بێ مەبەست جیابکاتەوە، سروشت جارێکی دی لە ئاستێکی بەرزتردا ووردترو بەسەلیقەتر کار ئەنجام دەدات نەك وەك ئەوەی لە کارامەیی مرۆڤدا بەرچاو دەکەوێت، وەك دیتمان مرۆڤ لاسایی ڕێکوپێکی سروشتدەکاتەوە.

لەبەرئەوە مرۆڤ هەر لە سروشتدا لە ڕۆح و جەستە پێکهاتووە، وە ڕۆحیش هەردەم لە جەستە باشترە، وە لەبەرئەوەی ئەو هەمیشە لەوە نزمترەو لە خزمەتی بەرزتردایە، بۆیە جەستەش لە پێناوی ڕۆحدایە. وەك دەزانرێت کە بەشێکی ڕۆح ئاقڵمەندە وە بەشەکەی دیکەش نا، کە ئەم بەشە نزمە دەگرێتەوە. ئیدی بەشە بێ ئەقڵەکە





لە خزمەت ئەو بەشەدایە کە ئاقڵە.[4] لەو بەشە خاوەن ئەقڵەدا توانستی بیرکردنەوە هەیە. ئیدی هەموو شتێك لە پێناو توانای بیرکردنەوەدایە کەئەمەش ئەنجامێکە کەنکوڵی لێناکرێت لەم ڕوونکردنەوەیەدا.

## ٢٤

دواجار توانستی بیرکردنەوەش خۆی لەبەکاربردن و هەرسکردنی ئەو بیروهزرانەدا دەبینێتەوە کە وەك گریمانەیەکی بینراو دادەنرێت. وەك چۆن بەکارهێنانی توانای بینین شتێك دەگرێتەوە کە دەشێت ببینرێت.[5] ئیدی ئەوە بیرکردنەوەو توانای بیرکردنەوەیە کە شایانی خۆماندووکردنە بۆ مرۆڤ: چونکە ئەوەی شتێکی دیکەبێت لە پێناوی ڕۆحدا جێگای خۆماندووکردنە-وەدەستخستنە- وە توانای بیرکردنەوە باشترین شتە کە لە خزمەت ڕۆحدابێت، چونکە هەموو شتێك لە پێناوی ئەوەدایە کە باشترینە{ڕۆح}.

[4] Aristoteles; *Ethica Nicomachea* I, 7 (1098 a 1-18).
[5] Aristoteles, *De anima* III, 2 (426 a 13).





## ٢٥

ئـەو بیرکردنەوانـەی کـە شـایانی خۆمانـدوکردنن وەك پێـشتر دەرکـەوت، مـرۆڤ بـە ئـازاد نـاوی دەبـات. بـەڵام ئـەو بیرکردنەوانـەی کـە زانـین وزانـست لـە پێنـاو مەبەسـتێکی دیکە بەکاردێت {نەك لـە پێنـاو ڕۆحـدا}لـە خزمـەتکارێکی کۆیلـە دەچـن. ئـەوەی لـە پێنـاو خۆیـدا هـەوڵی بـۆ بـدرێت هەمیشە پلەیەکی بەرزتری هەیە وەك لـەوەی کـە لـە پێنـاو شتێکی دیکەدا بەکاربێت، چونکە ئـەوەی ئـازادە باڵادەسـترە لەوەی کە ژێردەستەیە.[4]

## ٢٦

گـەر مرۆڤـەکان لـەکاتی ڕەفتارکردنـدا ئـەقڵی خۆیـان بەکاربهێنن، ئـەوا ئـەقڵ سـەرۆکاری دەکـات، وە هـەروەها لـە

[4] لە ڕێی ئەو دژایەتیەی نێوان "ئازاد"و"خزمەتکار-کۆیلە" دەیەوێت ئەرستۆ ئاشکرای بکات کەلەوسەردەمەدا ڕەوشێکی حاشاهەڵنەگربووە. وەك چۆن لەم تێگەیشتنەدا جەستە وەك ئامێری ڕۆح دەژمێرێت، ئاوەهاش پێناسەی کۆیلە وەك ئامانێکی زیندوو ئامێری ئاغاکەی پێناسەدەکرێت.








حاڵەتێکدا کەمرۆڤ چاوی بڕیبێتە سودوقازانجێك و بیەوێت بەدی بهێنێت. ﴿لە کاتی هەڵسوکەوت و ڕەفتاردا کاتێـك کـە دەیەوێت لێکدانەوەیـەك بکـات، ئەوسـاکە ئـاوەزیش ڕۆڵێکـی بڕیاردەری دەبێت لەسەر کارەکە، گەرچـی زۆرێکـی لـەرێگای لاشەوە بێتە ئاراوە﴾.

## ٢٧

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو بیرکردنەوانەش تـەنها لە پێناو تێگەیشتندایە، پلەوپایەیـەکی بـەرزترو گرنگتریـان هەیە لەو بیرکردنەوانەی کە بە مەبەستێکی دیکە دەکـرێن. تێگەیشتن و ڕامان بۆخۆی پلەیەکی بەرزی هەیە و ئەوەشی لەگەڵیدا جێگەی نرخاندنە، دانایی و توانای بیرکردنەوەیـە. بەتایبـەت ئـەو ڕامـان و تێگەیـشتنانەی کـە پەیوەسـتن بـە ڕەفتـارو هەڵـسوکەوتەوە شـیاو شـایەنی دونیابینییـەکی فەلـسەفیە. لێـرەوە باشـەو چـاکە و ئـەوەی شایـستەیە لـەو جۆرە ڕامانە کە پەیوەستە بە داناییەوە. ﴿لێـرەوە بـە هـیچ شـێوەیەك ڕامـانێکی ڕەمـەکی نییـە دیـارە هـەموو جـۆرە بیرکردنەوەیــەك شــیاو نییــە بــەڵام بەتــەنها تێگەیــشتن-

مامۆستا-فێرکەر کە هێڵێکی ڕێنوێنی دەکێشێت پەیوەستە بە بنەمای ڕێکخستنەوە: مرۆڤ دەتوانێ ئەو شێوازە ڕامانە بەهەند وەربگرێت کە نزیکەو سەر بەکردەی دانایە﴾.

## ٢٨

گەر توانای بیرکردنەوەو سەرنجدان لە مرۆڤ بسەنرێتەوە، ئەوا لە ڕوەکێك دەچێت، بەڵام ئەگەر بە تەنها توانای بیرکردنەوەی لێ بسەنرێتەوە دەبێتە ئاژەڵێك، بەڵام گەر خۆی ڕزگاربکات لە بێ ئەقڵی و توانای بپارێزێت، ئەوسا یەکسان دەبێت لەگەڵ خودادا.[4]

## ٢٩

چونکە ئەوەی ئێمە لە زیندەوەرو گیانلەبەرانی دیکە جوادەکاتەوە تەنها لەو جۆرە ژیانەدا ئاشکرادەبێت، کە تێیدا هیچ جێگایەك بۆ ڕێکەوت یاخود جێگایەك بۆ بەهایەکی تایبەتمەندی نییە. لە هەندێك لە گیانلەبەرانەدا

---

[4] Aristoteles, *Ehtica Nicomachea* X, 7(1177 a 14-18) & (1177 b 30-32)& "سەیری کۆتایی "لە ستایششی فەلسەفەدا





دەشێت بلێیسەیەك لە ئاوەز و ڕامان بەدی بکرێت، بەڵام بێ ئەوەی خاوەنی هیچ جۆرە ڕامانێکی دانایی- فەلسەفی بێت. ئەمە تەنها بۆ خوداکان هەیە، بەڵام سەبارەت بە هەستکردن و خۆماکەکان{غەریزەکان}، بەڵام سەبارەت بە تیژیی و هێزەوە مرۆڤ لەدوای گیانلەبەرەکانی تر دێت.[4]

## ٣٠

﴿ئەقڵ و ئاوەز تەواو کۆکە لەگەڵ ئەوەی کە چاکە، وە بەبڕیارێکی کۆدەنگی ئەقڵ لەچەمکی چاکەدایە. ئیدی ئەو مرۆڤەی بەپێی ئەم ڕێوشوێنە دەژی بەهیچ کلۆجێ خۆی ناکاتە ژێرباری ڕێکەوتەوە، بەڵکو لە هەموو کەسێك زێتر دەزانێت کە خۆ قوتاربکات لەوەی کە دەرئەنجامی ڕێکەوتە. لەبەرئەوە کەسێك بەهەموو بڕوای خۆی دەتوانێت ژیانی خۆی بەو شێوە درێژەپێ بدات کەخۆی تەواو متمانەی پێەتی﴾

---

[4] Aristoteles, *De anima* II, 9(421 a 20-22).





## فەلسەفە دەسدەکەوێت و بەکەڵکیشە

۳۱

﴿ئینجا ئێستا خاڵێکی دیکەش هەیە: لەبەرئەوەی ئێمە هەردەم شتێك هەڵدەبژێرین کە لەبەردەستدایەو بەکەڵکیش بێت، بۆیە دەبێت مرۆڤ دان بەوەدا بنێت کە فەلسەفە هەموو ئەو خەسڵەتانەی تێیدایە{کەبەکەڵکە و دەستیشدەکەوێت}. گەرچی ئاڵۆزی‌و گرانی وەدەستخستنی {فەلسەفە} ناکۆك نییە لەتەك کەڵکوسوودیدا. وەلێ هەردەم ئێمە بۆ شتێك هەوڵ و ڕەنج ئەدەین کە وەدەستخستنی ئاسانە.

## زانین دەربارەی واقیع

۳۲

سەلماندنی ئەو ڕاستیە سەخت نییە کە ئێمە دەتوانین







زانست سەبارەت بەوەی کە ڕاست وبەکەڵکە وەدەستبخەین، هەروەها بەهەمان شێوەش دەتوانین چ لە سروشت و چ ئەوەی لە واقیعایە ئەوە بسەلمێنێت.

۳۳

وە مرۆڤ دەتوانێت ڕۆبچێت{بپشکنێت} لە وەی چاکترە وەك لەوەی بەپلەیەکی دواترو نزمتر دێت. هەروەها دەتوانێ ئەوە بپشکنێت وەك چۆن بەرترو باڵاترە وەك لەوەی کە نزمترە. زانینی دڵنیایی-جەختکردن- هەمیشە بەرئەنجامی شتێکی دیاریکراوە وەك لەوەی بەرئەنجامی شتێکی نارێك و نادیار بێت. سەرەڕای ئەوەش زانینی دڵنیا لەئەوەی کە بەهۆی هۆکارەکانەوە دەبێت نەك بەرئەنجامی شوێنەوارەکان.[4] هاوکات ئاشکرایە کە ئەوەی چاکە هەمیشە دەستنیشانکراو و ڕێکخراوە وەك لەوەی کەخراپە، بۆ

[4] Aristoteles, Metaphisica, 1, 2(982 a 12-20).
واتە دڵنیایی لە زانستدا ئەستەم نییە کاتێك شتێکی دیاریکراو دەستنیشان دەکەین دەتوانین بگەینە ئەنجامێکی دڵنیاو دوور لەگومان. پاشان زانست دەبێت بەردەوام لە هۆکارەکانی لێکۆڵینەوە نەك باس لەو دەرئەنجامانە بکات چونکە ئەمەیان ئاسانە، وە.کوردی

نموونە مرۆڤی بەرێز لەچاو مرۆڤێكی خراپدا {كە گومانی تێیدا نییە كامیان باشترە}. بەم شێوە دەبێت لەنێوانیاندا و بەرامبەر یەكتری هەمان جیاوازی دەربخەین. ئیدی ئەوی لە پێشترەوە بێت، ئەوە بێگومان هۆكارە بۆئەوەی كە لەپاشیەوە دێت. چونكە گەر كاتێك ئەوی كەلە پێشەوە دێت، لابېرێت ئەوا ڕیزبەندی ئەوانەی كە لەدوای ئەوەوە دێن تێكدەچن{بۆنموونە لەیەكدواهاتنی ژمارەكان}. لێرەوە بەهەمان شێوە لەبەر ئەنجامی نەمانی ژمارەكانیشدا ئەو هێڵە زنجیرەیەش نامێنێت. وەك چۆن ڕووبەر نامێنێت گەر تێزەكانیش نەمان. هەروەها وەك چۆن لاشە لەناودەچێت بەنەمانی بارستایی و ڕووبەرەكان، ئاوەهاش پیتەكانی زمان نامێنێت بەنەمانی زمان.[4]

٣٤

لێرەوە گەر ڕۆح چاكترو لە پێشتریش بێت لەجەستە(چونكە ڕۆح لەسروشتی خۆیدا ڕۆڵی سەرپەشتی

[4] Aristoteles *Topica* II, 4(141 b 5-8).





و ڕێنمایی هەیە لە بەرامبەر جەستەدا)، وەئەگەر بۆ جەستە كۆمەڵێك بەهرەو كارامەیی و دیدوبۆچوون هەبێت وەك پزیشكی و خۆراك (دیارە ئەمە وەك ڕاستیەكی بێگومان دەژمێرێت و سەبارەت بە ئەوانەی تەندروستی و خۆراكیان بەهەند وەرگرتووە بۆیەكا لەش ساغن). ئینجا ئاشكرایە كە بەهەمان شێوە بۆ ڕۆحیش مشورخواردن و خۆراكی تایبەتی هەیە كە چۆن پێی بەخێوبكرێت، لەبەرئەوە ئێمەش دەتوانین ئەو شتانە فێربین وەك چۆن ئەو شتانەی كە كەمتر لێیان دڵنیاین كە بەهەمان شێوەیش ڕەفتاری لەگەڵدا بكەین وەك چۆن ئەو شتانەی كە تێگەیشتن لێان سەختە مشوریان بخۆین.

٣٥

زانیاری سەبارەت بە سروشت ئەمەیە: هیچ گومانی تێیدا نییە كە تێگەیشتن و بیروبۆچوون سەبارەت بە هۆكارەكان و بەشەكانییەوە لەپێش ئەوەوەیە كە لەدواییدا دێت. بەڵام ئەمە وەك ڕاستیەكی باڵا ناژمێرێت. لەهەمان





کاتیشدا شتە یەکەمینەکانیشی {سەرەتاییەکان} لەوێوە نایەت و دروست نابێت، بەڵکو بەهۆیانەوە{شتە یەکەمینەکانەوە} کە چی دێت بەدوایاندا.

٣٦

جا ئەو شتە یەکەمینانە ئاگرو هەوا یاخود ژمارەکان و ئەو شتە سروشتیانە بێت کە هۆکاری یەکەمی دروستبونی شتەکانی دیکەن، بەبێ زانیاری لە بارەیانەوە هەرگیز ناتوانین شتەکانی دیکە کە لەوان پێکدێن تێ بگەین و بزانین. چۆن مرۆڤ دەتوانێت واژەیەك تێبگات کە زانیاری سەبارەت بە برگەی وشە{دەنگ} نەبێت. هەروەها چۆن دەتوانێت لەو بزوێنانە بگات گەر پیتەکان نەناسێتەوە؟[3]

٣٧

[3]. ئەم بەراوردە واتایەکی قوڵتر دەگرێتە خۆی گەرمرۆڤ بیربکاتەوە کە ئەرستۆ سەبارەت بە "پیت" و چ سەبارەت بە ئیلمێنت، واتە بنەما سەرەکیەکانی شتێك شەی Stoicheion بەکاردەهێنێت








ئیدی ئێستا زانینێکی دڵنیا و بێ گومان سەبارەت بە واقیع(دەوروبەر) و سەبارەت بە باشترین خەسڵەتەکانی ڕۆح هەیە، وە ئێمەش لە تواناماندایە ئەم زانیاریە وەدەستخەین، بەمەرجێك وەك باسکرا خۆمان پابەندبکەین بەو مەرجە سەرەکیانەی کە بۆ وەدەستخستنی زانیاری دوور لەگومان پێویستن.

## دیدی فەلسەفی

٣٨

سەبارەت بەوەی داخۆ دیدێکی فەلسەفی دەربارەی شتە چاکەکان باشترین و بەسوودترین ڕێگایە بۆ تێگەیشتن لەوەی کە لێرە بەدواوە دەردەکەوێت. هەموو هاودەنگین لەسەر ئەوەی کە پیاو خاوەنی باشترین تایبەتێتی و باشتریین بەهرە دەبێت ئینجا دەبێتە سەرکردە. هەروەها ئاشکرایە کە دەبێت سەرمەشق و باڵادەست بێت. ئەم یاسایەش جۆرێکە لە دیدوبۆچوون و هاوکاتیش لەسەر

بناغەی دیدوبۆچوونێك دارێژراوە.

## ٣٩

سەرەڕای ئەمەش دەتوانێ ستانداردێكی {پێودانگێكی} ووردو بەسەلیقە یاخود پێوەرێك دابڕێژێت كە كامە چاك و خراپترە لەو كەسەی كە دیدوبۆچوونێكی هەیە بۆ چاكە؟ وە هەر كاتێك، هەرچیەك ئەو هەڵدەبژێرێت پابەندی زانستی دڵنیابێت، بەتایبەت ئەوە كە باشە بۆمان هەڵدەبژێرێ. بەمەش ئەو دەكەوێتە ململانێ لەگەڵ ئەوەی كە خراپە.

## ٤٠

لەبەرئەوە هەریەكێك لە ئێمە شتێك هەڵدەبژێرێت كە باشترینە بۆی، وە دەستورو بەرنامەكەشی لەگەڵ ئەوەدا دەگونجێنێت. بەم شێوەیە كەسێكی سەرراست ژیانێكی








ڕاستگۆیانە هەڵدەبژێرێ. هەروەها مرۆڤی ئازاو نەبەردیش ئەوە هەڵدەبژێرێ كە ئارادەیەك دەریخات وەك چۆن مرۆڤێكی میانەڕەو شتێ هەڵدەبژێرێت كە گوزەرانێكی میانەڕەوی بداتێ.[5] هەر بۆیە مرۆڤی ئاقڵ و هۆشیار، گەڕان بەدوای دیدوبۆچووندا لەسەروو هەموو شتێكی دیكەوە دادەنێت، چونكە لە وێدا ئەو توانستە{بیركردنەوەیە} بەكاردێنێت. بێگومان لێرەوە بەبێ بەهێزترین هەڵسەنگاندن و مەزەنەكردن دیدی فەلسەفی لەناو هەموو شتەچاكەكاندا بەرزترینیانە.

## ٤١

هەمان گریمانە باشتر تێدەگەین بەپێی ئەم لێكدانەوەیە. وەدەستخستنی دیدوبۆچوون و تێگەیشتن بۆ مرۆڤ شتگەلێكی بە بەهان، چونكو بەبێ ئەو زیندەچالاكیانە واتاو بەهای بوونی مرۆڤ ئەستەمە. لەسەر

[5] Aristoteles, *Ethica Nicomachea* X, 6 (1176 a 26-27).

ئەووشەوە ئەم چالاكیانە بە كەڵكن بۆ ژیان، چونكە شتی چاك لەخۆیەوە نایەتە ڕێمان گەر بەهۆی هەوڵدان و وتووێژەوە و بەبێ تێگەیشتن نەیەتە دی.

﴿جا ئاخۆ ژیانێكی بەختەوەر لە خۆشیدایە یاخود لە هەبوونی باشترین خەسڵەتەكاندایە، یاخود لە دیدوبۆچوونەكاندایەو لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا كە مرۆڤ دەبێت خەریكی فەلسەفە بێت. چونكە ئەوانە بەتایبەت و بەبێ گومان لەبەرئەنجامی خەریك بوون بەفەلسەفەوە لە خزمەت ئێمەدایە﴾.

## ٤٢

لەهەموو جۆرە زانستێكی دڵنیادا مرۆڤ بەدوای شتێكدا دەگەڕێت كە لە دەرەوەیە و خوازیاریەتی و لەوێوە ئەوەی دەستبكەوێت كە بەڵكو بەسوودە، ئەمە تایبەتمەندی كەسێكە كە بە ڕەهایی نەزانێت چ مەودایەك لە نێوان







ئەوەی كە چاكەو ئەوی كە پێویستە كامەیە.[5] دیارە ئەم جیاوازیە زۆر گەورەیە. چونكە كاتێك حەزەكانمان لە پێناو گەیشتن بە شتێكی دیكەدا وێڵەو هاوكات ئێمە ناتوانین دەست لەو حەزانە هەڵبگرین چونكە لەبۆ ژیان پێویستن، بۆیە دەبنە "زەرورەت"و بە مەرجێكی گرنگ ناودەبرێن. بەلام ئەوشتەی كە لە پێناو خۆیدایە نەك شتێكی دیكەدا، ئەوا ئەوە واتای چاكەیە پڕ بەپڕی وشەكە خۆیەتی. لەبەرئەوە{چاكە} لە پێناو شتی دیكەدا {جگەلە خۆی} هەڵنابژێردرێت، چونكە ئەوەی لە پێناوێكی دیكەدا هەڵدەبژێردرێت دەبێت بۆ شتێكی كە باشبێت و، بەمەش شتەكە بە ناكۆتایی لە پێناو ئەم و ئەودایە: كە هەر دەبێت لە شوێنێكدا كۆتایی پێ بێت.[5] لەبەر ئەوە شتێكی ناماقووڵە كە لەهەموو شتێكدا بەدوای حەزێكدا بگەڕێن جگەلە لەشتەكە خۆی، وەهەروەها پرسیاربكەین: "ئەوە چ كەڵكی هەیە بۆمان؟" وە "بۆچی دەتوانین بەكاری

[5] Aristoteles, *Politica* VIII, 3 (1338 b 2-4).

[5] Aristoteles, *Metaphisica*, II, 2 (94 a 1-29). ئەمە یەكێكە لەو وتەزا بەهادارانەی ئەرستۆیە، سەیری

بهێـنین؟". بێگومـان ئەوکەسـە بـەلای ئێمـەوە لـە کەسـێك ناچێت کە بزانێت کامـە جوان و چاکە. وە لـەوەش ناچێت کە بتوانێت جیاوازی لە نێـوان هۆکـارو مـەرجی زەروریـشدا بکات.[6]

## ٤٣

بێگومان بەمە ڕاستیەکی گەورە دەردەکـەوێت کـە مـرۆڤ دەبێـت پـەی پـێ ببـات، گـەر ئێمـە بمانـەوێت لـە خولیـای خۆماندا بەرەو دورگـەکانی بەختـەوەری بگوێزینـەوە. لـەبۆ ئەمـەش هـیچ پێویـستیەك نییـەو لـە هـیچ شـوێنێك ئێمـە ناتوانین سودوکەڵکی بۆ بچڕین، چونکە ئەوەی دەمێنێتـەوە هـەر بیرکرنـەوەو تێڕامانـە. ئیـدی ئەمـەش تـەواو ئـەو وەسفەیە بۆ ژیانی مرۆڤە ئازادەکان. ئەگەر ئەمـە ڕاسـتبێت ئەوا هـەموو یـەکێك لـە ئێمـە بەهـەق شـەرم نایگرێـت گـەر کاتێك بۆی بڕەخسێت تاکو لەسەر دوورگەکانی بەختەوەری بـــژێت و وە ئـــەو شتانەشـــی کـــە پێویـــستە تێیـــدا بەکارنەهێنێت؟

[6] Plato, *De staat* 493a سەبارەت بەم جیکرنەوەیە سەیری







کەواتـە ئـەو پاداشـت و کرێیـەی کـە زانـست بـەمرۆڤی دەدات شـتێك نییـە مـرۆڤ بەسـوك و چـروك سـەیری بکـات، چونکە ئەو بەهایەی کەزانست ئەیبەخشێت کەم نییە. وەك چـۆن ئێمـە بەبۆچـوونی شـاعیرە ناودارەکـان لـە هـادێس[5] ئێمــە هــەردەم بــەرووبوومی سەرڕاســتی و داوەری خۆمــان دەرنینــەوە، ئاوەهــاش دەتــوانین بــەرووبوومی تێڕامــانی فەلسەفی لە دوورگەکانی بەختەوەراندا بچنینەوە.[6]

## ٤٤

هـەروەها دەشـێت جێگـەی سەرسـوڕمان نـەبێت ئەگـەر تێڕامانی فەلسەفیش بێسوود یاخود بێ کـەڵك دەربکـەوێت. ئێمە لافی ئەوە لێنادەین کە سوودبەخـشە، بـەڵکو فەلـسەفە بەبەهایە، وەلەبەر هیـچ شتێکی دیکە هەڵنابژێردرێت.

[5] هـادێس خـوای ژێرجیهانـە. مەبەسـت لـە جیهـانی خـوارەوە یـا ژێرجیهانـە بەگشتی( Goden ABC, Griekse en Romeinse Mythologische Figuren, vrienden van het Gymnasium 2004- —وەرگێـڕی کوردی) . هەروەها سەیری بەراوردی ئەشکەوتەکەی پلاتۆ 519b-cبکە لە کۆماردا

[6] Aristoteles, *Ethica Nicomachea* X, 8 (1178 b 7-24),

وەك ئێمە چۆن بەرەو ئۆڵیمپیا دەچین لە پێناو خودی یاریەکەدا، هەروەها گەرچی لەوێوە هیچ سوودگەلێکی تری ئێمە نەبێت (چونکە ئامادەبوونمان لەوێکانێ لە پارەکە بەنرخترە)، هەروەك چۆن ئێمە جەماوەرێکین لە ڤیستیڤاڵی شانۆیی دیۆنیسوس دا، نەك لەبەرئەوەی ئەکتەرەکان شتێك وەردەگرن (چونکە ئێمە پارە ئەدەین بۆی)، وە چۆن ئێمە چەندین ڤیستیڤاڵ لە پارە بەگرنگتر دەزانین، بەهەمان شێوەش دەبێت مرۆڤ تێڕامان لە شتێکی بالا لەوە بەرزتر بنرخێنێت کەقازانجێکی هەیە. ئیدی ڕاست نییە کەمرۆڤ خۆی زۆر ماندووبکات بۆ ئەوەی بەتەنها تەماشای نمایشێك بکات کە ئەکتەرەکان وەك ژن یاخود کۆیلە کە تێیدا ڕادەکەن، یاخود دەجەنگێن، وەلەلایەکی دیکەیشەوە وەك چۆن زۆری لەسەر نییە کە بەبێ بەرامبەر و پاداشت ڕاستی ئەوەی کەهەیە و ئەوەشی کەواقیعە تێڕامێنێ لێی؟

٤٥







﴿لەوانەیە ئێمە بەم شێوەیەیش واتە لەسروشتەوە بەمەبەستەوە هەڵسوکەوت دەکەین، ئاوەهاش دەگەینە ئەوەی کە دەبێت ئامۆژگاری بکەین بۆ وەدەستخستنی تێگەیشتنی فەلسەفی وەك شتێکی چاك و کەبۆخۆی بەهادارە، هەروەها کاتێکیش کە ئەمە {فەلسەفە} چشتێکی وای لێناکەوێتەوە بۆ ژیانی مرۆڤ﴾

## تێڕامان{بیرکردنەوە}و هەڵسوکەوت

٤٦

بۆئەوەی مرۆڤ بتوانێت ئەوە بدۆزێتەوە کە دیدوتێڕامان بەهایەکی گەورەی بۆ ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ هەیە، دەتوانرێت لەڕێی کارزانی و کارامەیی مرۆڤەوە دەربخرێت. وەك پزیشکە زیرەکەکان و ئەوانەی مەشق دەکەن هاودەنگن لەسەر ئەوەی کە گەر مرۆڤ بیەوێت

پزیشکێ یا مەشقکەرێکی باش دەربچێت، دەبێت لە سروشت بگات و بزانێت، بەهەمان شێوەش دەبێت یاسامەندی باش ئاگایان لەمە بێت{سروشت چونکە ئەم ئاگابوونە باشترین شتە بۆ جەستە} بەڵام یاسادانەرەکان کە زێتر سەرقاڵی خەسڵەتە بەرزەکانی ڕۆحن و پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە ڕێوشوێن بۆ سەرکەوتن یا نشوستی کۆمەڵ دەستنیشان دەکەن: بۆیە ئەوان {یاسادانەرەکان}زێتر پێویستیان بە فەلسەفە هەیە.

## ٤٧

بەڵام لە بەهرە پیشەییەکانی دیکەش باشترین ئامێرو ئامراز لە سروشتدا دەدۆزرێتەوە وەك تیروکەوان، ڕاستەو گۆشەپێو، گۆنیای هونەری دارتاشی. لەمانە بەشێکیان لە ئاوەوە و بەشێکی دیکەیان لە هەواو و ئەویتریان لە تیشکی خۆرەوە وەرگیراون. بە بەکارهێنانی ئەمانە ئێمە بڕیارێك دروستدەکەین کە تاچەند لەسەرئەنجامدا شتێك ڕاست و تەختە. بەهەمان شێوەش دەبێت فەرمانڕەوا هەڵگری بڕێك







نۆرم و پێوەربێت کەلە سروشت و واقیعەوە وەریگرتبێت بۆئەوەی بەهۆیەوە بتوانێ بڕیاری ئەوە بدات کامە ڕاستەو کامە باش و کامەش بەسوودە. وەك چۆن لە پیشەدەستیەکان ئامێرو ئامرازەکان لەپیشە جیاوازەکاندا بەکار دێت، ئاوەهاش ئەو یاسایە باشترە کە زێتر لەگەڵ سروشتدا کۆکە و دەشتنیشانکراوە.[5]

## ٤٨

ئیدی ئەم پلەیە بۆکەسێك بەدەست نایەت ئەگەر خۆی سەرقاڵ نەکات بەفەلسەفەوە و زانیاری تەواویشی لەسەر واقیع نەبێت. سەرەڕای ئەوەی ئەوانە پیشەیەکی دیکەی بەهرەکان پراکتیزە دەکەن لەبەکارهێنانی ئامرازو ئامێرەکاندا کە هێندە بیر لە پرەنسیپە یەکەمینەکان ناکەنەوە، بەڵکو کارکردنیان لە پرەنسیپەکانەوە دوورە،

[4] یاسادانانیش بۆخۆی بەهرەو کارامەییەکە کەجۆرێك لاسایکردنەوەی سروشتی تێیدایە: چونکە لە سروشت دەستپێشکەریەکان وەردەگرێت و پاشان پێشبڕکێی لەگەڵ ئەوەی سوشتدا دەکات بەو مەبەستەی ئەوە دەربخات کە یاساکان شتێکی ڕەمەکی و دژ بەسروشتی مرۆڤ نین.

زێتر پیشه وەردەگرن بەڵام لێكدانەوه لەسەر ئەزمونی كارەكانیان دادەمەزرێنن{نەك بیركردنەوه لەپرەنسیپیه سەرەكیەكان}. ئەوه تەنها فەیلەسوفه كه شته رێك و ڕەوانەكان وەك مۆدێلێك وەردەگرێت: ئیدی {كاری ئەو} تەنها ئەوەیه كه ئەو لێی دەنوارێت نەك ئەوەی لاسایی بكاتەوه.

## ٤٩

وەك چۆن بەنایەك ناماقوڵی دەكات كاتێك كه مەتره بەكارناهێنێت یاخود هەر ئامێرێكی هاوشێوه، بەڵكو دەچێت لاسایی بیناكانی دیكه دەكاتەوه. ئاوەهاش كەسێك كه كارێك دەگرێته ئەستۆی یا یاسا پراكتیزه دەكات بۆ كۆمەڵ ، یاخود لاسایی و چالاكی دەزگایەكی میری ئەگرێته ئەستۆی – بۆنموونه وەك هی خەڵكی سپارتا، كرێتنزەرس یاخود هەرگەلێكی دیكه، ئەوا یاساناسێكی قاڵ و باش نییه. لاسایكردنەوەی شتێك كەجوان نییه، ناتوانێت بۆخۆی جوان بێت. وه لاسایكردنەوەی شتێ كه یەزدانی و نەمر نەبێت نابێته هۆی دروستبوونی شتێكی نەگۆڕو نەمر. نەخێر،







ئاشكراشه كه له هەموو ئەو كەسانەی كه شتێك دەهێننه بوون، بەتەنها فەیلەسوفه كه یاساكان بەنەگۆڕی و ڕەفتارەكانی به پەسەندیو خانەدانی دەمێنێتەوه.

## ٥٠

ئەوەی كه هەموو ژیانی به چاو بڕینه ئەوەی كه سروشتیه و یەزدانییه بەسەر دەبات. هەروەها وەك پیاوێكی فەرمانڕەواو كاربەدەست، ئەویش چاوی لەوەیه كه هەتاهەتایی و نەگۆڕه و ڕەگ لەوێدا دادەكوتێت و به سەربەستی ژیان بەڕێدەكات.[6]

## ٥١

بێگومان زەمینەی هەر زانستێكی ڕاستەقینه تێڕامانه، هەروەها ئەمه ئەگەرێكمان دەداتێ كه هەموو شتێك هاوكۆك پێی كه بێته ئاراوه، هەروەك چۆن دیدو بینین بۆخۆی هیچ شتێك ناهێنێته بوون، لەبەرئەوەی هەبوون

[6] Plato, *Politia* 500 b-c; idem *Policicus* 296 e.

تـەنها ئەرکێکـە کـە دەبێـت لـە شـتە بینـراو و جیاوازەکـان جیابکرێتــەوە و ڕوونیــشی بکاتــەوە، بــەڵام ئەگەرێکیــشمان دەداتێ بەهۆی ئەوەی کە ئێمە دەتـوانین ببیـنین و ڕەفتـار بکـەین لەهـەموو شـتێکدا کـە هاوکاریمـان دەکـات (چـونکە بەبێ توانای بینین بەدەگمەن نەبێت ناتوانین ببزوێنن).[6]

هەروەها ئاوەهاش ئاشکرایە کە ئێمـە چـەند ڕەفتـارێکی بـێ ئــەژمار بەئــەنجام دەگەیــەنێنین وە پــشت بــەزانیاری دەبەستین، گەرچی ئـەو زانیاریانـە لـە بنەڕەتـەوە پـشت بـە تێڕامــان دەبەســتێت. هــەروەها شــتێك هەڵدەبــژێرین و خۆشمـان لـەوی دیکـە لادەدەیـن، بەشـێوەیەکی گـشتی ئـەوە چاکە کە بەهۆی زانستەوە دەستدەکەوێت.

## زانین و هەوڵدان بۆی

**٥٢**

[6] بۆئـــەوی جیاوازیـــەکان بـــەدی بکـــەبن ئاگـــاداربوون و وریـــای گۆڕانکاریـــە مەترسیدارەکانیش بین لە حاڵەتێکدا بۆنموونە نزیکبوونەوەی دوژمن.








کـێ نیـازی هـەبێت ئـەوەی کـە لەپێـشەوە باسـکرا تـاقی بکاتــەوە، دەبێــت لــە بــیری نەچــێت ئــەوەی کــە بــەهادارو بەسوودە بۆ ژیانی مرۆڤ بەتەنها لە زانست و زانین دا نییـە، بـــەڵکو لەبـــەکارهێنان و ڕەفتـــار پـــێ کردنیـــشدایە، تەندروستیمان بـەهۆی ئـەوەوە بـاش نابێـت کـە داخـۆ چـی تەندروسـتی دروسـتدەکات، بـەڵکو ئـەوەی کـە دەیـزانین دەربارەی تەندروستی بەسەر لاشەماندا جێ بـەجێ بکـەین. ئێمـە بەوەنـدە دەوڵەمەنـد نـابین گـەر بـزانین سـامانداری چیە، بەڵکو بەوە دەوڵەمەنددەبین کاتێك سامانێکی گـەورە پێکەوە بنـێن. بەهـەمان شـێوەش بۆنموونـە گـەر گـرنگترین شت باس بکەین، کاتێك ئێمە ژیانێکی باش بەسـەر دەبـەین، گـەر کـردەی بـاش ئـەنجام بـدەین نـەك تـەنها واقیـع یـاخود واقیعی دیکە بزانین و بناسین. ئیدی ئا لەوێدا بەختـەوەری ڕاستەقینە هەیە. لێرەوە گەر فەلسەفە بیەوێت بەکـەڵکبێت و ســوودبگەیەنێت، ئــەوا دەبێــت ســوودوکەڵکی لــەوەدابێ کەچی باش و چاکە ئەنجام بدرێت یاخود لەوەدایە کە کامـە چاکە ڕەفتاری پێ بکرێت.

٥٣

كەواتە پێویست ناكات لە فەلسەفە بترسین{لەبەر ئاڵۆزی}بەمەرجێك ئەگەر فەلسەفە-ئەمەش بۆچوونی خۆمە- بریتی بێت لە وەدەستخستن و بەكارهێنانی دانایی، وە دانایش بێگومان سەر بە بەرزترین بەهایە كەهەیە. ئیدی ناشێت مرۆڤ لە پێناوی پارەدا بە كەشتیەكەی هێراكلس بچێتە دەریاوە، لەكاتێكدا هیچ ڕەنج و پارەیەك نادەن بۆ وەدەستهێنان و تێگەیشتنی فەلسەفە. بێگومان ئا ئەمە ڕەفتارو خەسڵەتێكی دیاری مرۆڤێكە كە بەسروشت كۆیلەیە و هەربیەوێت بژی، بەڵام بەدوای ژیانێكی چاكدا {ئازادا} وێڵ نەبێت. هەروەها لە پێناوی شوێنكەوتنی ڕای گشتی دا و نەك چاوەڕێكردن كە گشتی جەماوەر شوێن ڕاوبۆچوونی ئەو بكەوێت. هەروەها شوێن پارە بكەوێت بەبێ ئەوەی واقیعی ماقوڵ لەبەرچاو بگرێت.

## وەدەستخستنی فەلسەفە سەخت نییە








٥٤

سوودوكەڵكی بابەتەكەم وابزانم تاڕادەیەك باش دەركەوت، كە سوودوكەڵكی وەدەستخستنی فەلسەفە زۆر ئاسانترە لەوەی كە زێتر بە بەهاترە. وەبەم هۆیەوە مرۆڤ دەتوانێت خۆی بەم شێوەیەی خوارەوە قایل بكات.

٥٥

ئاشكرایە ئەوانەی فەلسەفەكاری دەكەن هیچ پاداشتێك لە خەڵكی وەرناگرن كەدەشێت ئەو هاوكاریە پاڵنەرێكی باشیش بێت بۆزێتر خۆماندوكردن، وە ئەو كەسانەی فەلسەفەكاریش دەكەن زۆر ماندویەتیان كێشاوە لە پێناو گەیشتن بە بەهرەو كارامەییەكانی دیكە كە بەهۆیانەوە لە ماوەیەكی كەمدا هەنگاوێكی بەرچاویان نا لە زانستە ئێكزاكتەكاندا{كتومتەكاندا} ﴿دەشێت لە چاوی مندا ئەمە

وەك نیشانەیەك بێت لەسەر سوكوئاسانی فەلسەفە﴾.

٥٦

بەڵگەیەكی دیكەش ئەوەیە كە مرۆڤەكان بایەخ بە كایەیەك دەدەن و خۆیان پێوەی سەرقاڵ دەكەن، وەڵێ شتەكانی دیكە فەرامۆش دەكەن. ئەمەش بەڵگەیەكی كەم نییە لەسەر خۆخەریكردنێكی تەواو لەگەڵ فەلسەفەدا، چونكە مرۆڤ بەشادمانییەوە لەو پێناوەدا ڕەنج و كۆشش دەكات. پاشان جیاوازی خۆخەریك كردن بە فەلسەفەوە لە چاكیەكانی دیكە جیاوازترە: كە بەهۆی ئەوەی بۆ ئەم كارە {فەلسەفە}هیچ ئامێرێك یاخود شوێنێكی تایبەت پێویست نییە، بەڵكو لە كوێی ئەم جیهانە مرۆڤ ئەقڵی خۆی بخاتە گەڕ دەتوانێت لەهەموو جێگایەك ڕاستی بەدەستبكەوێت، وەك ئەوەی ئەم ڕاستیە لەو شوێنانە ئامادەبن.

٥٧

بەمەش دەركەوت كە فەلسەفەكاری {بوارێك كە} ڕێی تێدەچێت و بەرزترین شتە لەنێو هەموو شتە بەبایەخ و







بەهادارەكانی دیكەدا. وەكی تریش وەدەستخستنیشی ئاسانە. لەبەرئەم هۆیانە خوێندنی فەلسەفە شایەنی خۆماندوكردن و هەوڵ بۆدانە.

## تێگەیشتنی فەلسەفی و جەستەو ڕۆح

٥٨

﴿ئیستاكێ دەبێت لەسەر كایەی تێگەیشتنی فەلسەفی بدوێین و هەروەها باسی ئەو هۆیەش بكەین كە بۆچی دەبێت ئێمە بەدوایدا {فەلسەفە} بگەڕێین: لە پێناو باشكردنی ئەم هۆیەدا گریمانەیەكی دیكە بكەین﴾.

٥٩

بێگومان بەشێك لە بوونی ئێمە ڕۆح و بەشەكەی دیش لاشەیە، یەكەمیان سەرپەرشتی و ڕێنوێنی بەشەكەی تر دەكات. ئیدی لاشە شوێنی ڕۆح دەكەوێت. وە ڕۆحیش بەشەكەی دیكە(جەستە) بەكار دەهێنێت، چونكە لاشە

ئامێرێکە بۆ ئەویتر. هەروەها بەکارهێنانی ئەویش کە ملکەچ کراوە. کەواتە ئامێر بەپێی دەسەڵاتی فەرماندەرەکە، ڕۆح دەڕوات بەڕێوە، واتە بەکار دەهێنرێت.

## 60

ڕۆحیش لە چەند بەشێك پێك دێت، بەشێکیان ئەقڵە(ئەم بەشە بەبێ سروشت ڕۆڵی سەرۆکاری و بڕیاردانی هەیە لەو شتانەی ئێمە بەرەو ڕووی دەبینەوە) و بەشەکەی دیکە ملکەچ و شوێنکەوتەیە و هەر لەسروشتەوە خەسڵەتێکی تێیدایە کە ئەویش دەبێت ڕینمایی کەربێت. تێکڕای لاشە وارێکخراوە کە بگونجێت لەگەڵ جۆری تایبەتی هەر بەشێکدا: چونکە گەیشتن بە ئەو دۆخە {ڕێکوپێك و هارمۆنییە}کارێکی چاکە.

## 61

وە لە ڕاستیدا ئەگەر باشترین و بەدەسەڵاترین و بەهاترین بەش{لەلاشەدا} جۆریەتی خۆی گەشە پێ بدات، ئەوا لەو حاڵەتەدا ڕێکوپێکیەکی چاك لە ئارادایە. وە تا ئەو







ئەندازەیەی شتێك کەلە سروشتەوە باشتر بێت، ئەوا بێگومان گەرچی ئەمە لەگەڵ سروشتیشدا بگونجێت کوالێتی{جۆریەتی} لەوەی کە هەیە باشتر دەبێت. وە گەر باشتر بکەوێتەوە کەکاتێك شتێك بەپێی سروشتی ڕێنمایی و سەرۆکاری بکات وەك بۆنموونە لەچاو گیانلەبەر و ئاژەڵاندا.[6] ئەوا بەهەمان شێوە ڕۆح باشترە لەلاشە (چونکە ڕۆح زێتر مەرجی سەرۆکاری و پێشەنگی تێیدایە). هەروەها ئەو بەشەی کە لە ڕۆحدایە وەك ئەقڵ وبیرکردنەوە ئەوە باشترە لەوانی دیکە. چونکە ئەو خەسڵەتەی کە لە فەرمانڕەوادا هەبێت و هەم شتیش یاساغ بکات وە لەهەمان کاتیشدا فەرمانمان پێ دەدات کەچی بکەین و چی نەکەین.

## ٦٢

ئیدی باشترین خەسڵەت ئەو بەشەیە گەر هەرچیەکیش بێت. جگەلەوەش خەسڵەتێکی دیکە نییە کە بەشێوەیەکی گشتی بۆ هەموو مرۆڤێك و بەتایبەت بۆ ئێمە باشتربێت

[6] Plato, *Politia*, 431a.

لەوە. بەڕای من مرۆڤ دەتوانێت بەرگەی ئەوە بگرێت کەجەوهەر و کرۆکی ئێمە لەو بەشەدایە{ئەوبەش چاکە کە ڕۆحە}. ئیدی بەتەواوی یاخود نا.[6]

## بیرکردنەوەو هەقیقەت

٦٣

لێرەوە گەر کەسێك لە سروشتەوە ئەرکی سەرشانی خۆی بەباشی بەڕێوەبەرێت ، نەك بەرێکەوت بەڵکو خۆبەخۆی، ئەوسا مرۆڤ بەهەق دەتوانێت بلێت کە ئەم ئەرکە چاکەو مرۆڤ دەتوانێ بشلێت کە کواڵیتی بەهۆی ئەوەوە ئەرکێکی خۆبەخۆی ئەنجامداوە، ئەمەش لە هەموو

[6] Aristoteles, *Ethica Nicomachea* IX, 8 (1168 b 31-1169 2).







ستایشێك زیاتر {بڕیاردەری}دەستنیشانکەری ئەو کواڵیتییە.

64

ئەو شتەی کە لێکدراوبێت و لە چەند بەشێك پێکهاتبێت و دەشێت ئەوە چەند چالاکیەکی جیاوازی هەبێت. بەڵام ئەوە هەر لە سروشتەوە تاکەو بوونی خۆی بەهۆی ئەو پەیوەندیەکە لە نێوان ئەو و شتێکی دیکەدایە دیاری نەکراوە، ئەوسا دەتوانین باس لەیەك کواڵیتی گرنگی دەستنیشانکراو بکەین.[6]

65

کەواتە ئەگەر مرۆڤ زیندەوەرێکی تاك و ئاگامەندی و بوونێتی خۆی بریتیبێت لە توانای بیرکردنەوەو ئەقڵ، ئەوا بۆ ئەو هیچ ئەرکێکی دیکە جگەلە گەیشتن بە ڕاستی و هەقیقەت نییە، بەواتایەکی دیکە گەیشتن بە ڕاستی ئەوەی کە هەیە. بەڵام ئەگەر بوونەوەرێك بێت کە زێتر لە

[6] Plato, Phaedrus 270c-e: هەروەها سەیری

توانایەکی هەبێت، ئەوا ئاشکرایە کە بە بەهاترین ئەرك ئەوەیە کە ئەوە بە زۆرتر بهێنێتە دی، بۆنموونە وەك تەندروستی لە حاڵەتی نوژداریدا و گەڕانەوەی کەشتیەوانێك بۆ ماڵ. ئەرکێکی باش بۆ ئەقڵ یاخود بۆ ئەو بەشەی کە لە ڕۆحدا بیردەکاتەوە  ئەوەیە کە خۆی بۆ ڕاستیەك تەرخانکردبێت یاخود بکات، کە نایەوێت ناوی ببرێت{پەیی پێ ببردرێت}،کەواتە هەقیقەت دیارترین ئەرکی ئەو بەشەی ڕۆحە.

## 66

ئەو ئەرکەش بەهۆی زانستێکی ڕاستەوە بەجێ دەگات، ئەرکەکەش باشتردەبێت گەر زانست لە پلەیەکی بەرزتردابێت. لە پێناو ئەو لێکدانەوەشدا زانست دیارترین مەبەستە تێیدا. بەتایبەت کاتێك لە دوو شتدا یەکێکیان زێتر ویستراو بوو بەهۆی ئەوی دیکەوە، ئەوا ئەم شتە باشتر و هەڵبژێردراوترە لە پێناو هەرشتێکدا کە هەروا هەڵدەبژێردرێت. بۆنموونە تەندروستی لە پێشترە لەوەی کە لەشساغی دروستدەکات. چونکە یەکێکیان بەرهەم و بەر







ئەنجامی ئەویتریانە.[6]

## 67

ئیدی هیچ شتێك زیاتر هێندەی فەلسەفە خواستراو و ویستراترو نییە، ئەگەر ئێمە حاڵەتێك بە یەکێکی تر بەراورد بکەین و بەمەش بڵێین کە ئەوە دیارترین {جێگەی}توانایە. ئەوبەشە زانایەی ڕۆح خۆبەخش یاخود لەگەڵ بەشێکی دیکە باشترە لەوەی ڕۆح بە تەنێ و هەر لەمەشەوە زانستی ڕاستەقینە باشترین خەسڵەتە کە لەدایك دەبێت.

## 68

کەواتە هیچ یەکێك لە کواڵیتیە تایبەتەکان بەرهەمی تێگەیشتن نین، بەڵکو لە ئاستێکی بەرزتردایە لەوانی تر. چونکە وەك چۆن ئەو ئامانجە کە دێتەدی هەمیشە لەو زانستە باشترە کە ئەو ئامانجە دێنێتەدی. بەهەمان شێوەش هەر هەموو کواڵێتی ڕۆح بەرهەمی ئەو تێگەیشتنەیە.

[6] Aristoteles, *Topica* III, 1 (116 b 24-32).

ئیدی ئەگەر تێگەیشتن بەرهەمداربێت ئەوا بە بەراورد بەخۆی دەبێت شتێکی دیکە بەرهەم بهێنێت وەك بۆنموونە هونەری بیناسازی خۆی بەشێك نییە لە بیناکە بە بەراورد لەگەڵ بیناکە خۆیدا. بە پێچەوانەی تێگەیشتنەوە کە یەکێکە لە باشترین خەسڵەتەکان و بەشێکە لە بەختەوەربوون. بەختەوەریی-بەختەوەربوون- لە بۆچوونی ئێمەدا بەرئەنجامی ئەو تێگەیشتنەیە یاخود هاویەکیشە لەگەڵیدا{لەگەڵ ئەو تێگەشتنەدا}.

69

بەم بۆچوونەبێت ئەستەمە تێگەیشتن جۆرێك لە زانستێکی بەرهەمدار بێت. ئاکام و ئەنجام دەبێت هەردەم لە ئاستێکی بەرزدابێت وەك لەوەی کە هەیە: بەڵام هیچ شتێك باڵاتر نییە لە تێگەیشتنی فەلسەفی. وەڵ بەرئەنجامی ئەوە جگەلە تێگەیشتن هیچی دیکە نییە. ئیدی دەبێت بڵێن کە ئەو زانستە خەسڵەتی تێڕامانی هەیە، چونکە ئەستەمە ئاکامە دواییەکەی {ئەو زانستە} بەرهەمهێنانی شتێك بێت.





## تێتگەیشتنی فەلسەفی باشترینە

70

کەواتە وەدەستخستنی تێگەیشتن و تێڕامان ئەرك و فەرمانی ڕۆحە و ئەم ئەرکەش باشترین شتە بۆمرۆڤ، وەك چۆن ئەرکی چاو لە بۆ بینین گرنگە: ئەگەرچی هەبوونی{چاو} باشترە لەحاڵەتێکا کە تەنها بۆ بینینش بێت وەك لەوەی کە بەهۆیەوە بێتە ئاراوە.[6]

71

سەرەڕای ئەمەش گەر یەکێك بەشتێکەوە ئالودەی گرت لەبەر خەسڵەتێکی لاوەکییەوە، ئەوا ڕوونە کە ئەو کەسە زێتر خوازیاری زیاتری بۆ ئەو خەسڵەتە دەبێت. بۆنموونە ئەگەر کەسێك ڕاهاتبێت لەسەر پیاسەکردن لەبەرئەوی ئەمە تەندروستیە{باشە} ئەوا بۆ ئەم ڕاکردنێکی دروستە و ئەشتوانێت هەڵبێت یاخود باشتر دەخوازێت و ویستی لەسەری هەیە. وە هەروەها ئەوکەسە لە پێشدا

[6] Aristoteles, *Metaphisyca* I, 1 () 980 a 24-26).





هەڵبژاردنێك {بڕیارێك} بۆدابینكردبێت چونكە لەوەوبەر ئەوەی زانیوە.

ئەگەر پەسەندترین ڕا لە تێگەیشتنی فەلسەفی بچێت-[6] كە ڕای پەسەند شیاوی خۆماندووكردنە تا ئەو ڕادەیەی لەسەر بنەمای هەقیقەت بێت، ئەوا لە تێگەیشتنی فەلسەفی دەچێت- و تێگەیشتنی فەلسەفی ڕێژەیەكی زێتری هەقیقەتی تێیدایە، لەبەر ئەوە تێگەیشتنی فەلسەفی لە ڕاوبۆچوونی دروست وڕاست لە پێشترە.

## ٧٢

سەرەڕای ئەمەش گەر ئێمە نرخ و بەهای دیتن لە پێناو خودی خۆیدا دیاری بكەین، بەڵگەیە كە بۆچی مرۆڤەكان پێ لەسەر هەبوونی تێگەیشتن و هەبوونی زانیاری زۆر دادەگرن.

[5] [6] لەوە دەچێت ئەریستۆ لێرەوە بیەوێت ئەو بابەتەی كەلە قوتابخانەی پلاتۆ اسكرا كە پەیوەندی نێوان "ڕاوبۆچوون" و"زانین"ە باسبكاتەوە.








## ٧٣

كێ بایەخ بەژیان بدات، بایەخیش بەهەبوونی تێگەیشتن و زانینیش دەدات. ئەو كەسانەی كە ئەمەیان بەلاوە گرنگە نەك لە پێناو هیچ هۆیەكی دیكەدا جگەلەوەی بەهۆی سەرنجدان و بەتایبەت بەهۆی بینینەوە: ئەو كەسانە بەتایبەت بایەخ بەتوانای بینین دەدەن، چونكە هەستی چاو بە بەراورد لەگەڵ بەرهەستەكانی دیكە جۆرێكە لە زانستی ڕاست.

## ٧٤

لە ڕاستیدا ژیان خۆی لەگەڵ نەبوونی ژیان{نا ژیان} بەئامادەبوونی{هەبوونی} سەرنج و بینینەوە جیادەكاتەوە، وە بەهۆی توانای سەرنجدانیشەوە پێناسەدەكرێت. بە لە دەستدانی توانای سەرنج و بینینەوە ژیان شایەنی خۆماندووكردنە وەك ئەوەی كە ژیان خۆی

لەدەستبدات بەنەمانی توانای بینین.[7]

## 75

توانای بینین خۆی لە بەرهەست وبینینەکانی دیکە هەر بەوە جیادەکاتەوە کە لەهەموویان ڕوونترە، وە لەبەر ئەو هۆیەشە کە ئێمە زۆر بایەخ بە بینین دەدەین. لەهەرجۆرێك لە بینینەکان توانایەك هەیە بۆ ئەوەی لە ڕێی لاشەوە زانیاری سەبارەت بە شتێك بەدەست بهێنین، بۆنموونە وەك بیستنی دەنگ وەردەگیرێت لە ڕێی گوێکانەوە.[6]

## ٧٦

کەواتە گەر ژیان شایەنی ماندوبوون بێت ئەوە بەهۆی بینینەوەیە، وە گەر بینین جۆرێك لە فێربوونی زانستی و

---

[7] سەبارەت بەئەم لێکچوونە سەیری: Aristoteles, *Ethica Eudemia* VII, 12 (1244 b 26-28)

[6] بەرهەستەکان وەك توانایەکی بێ بایەخ و بێ هودەی ڕۆح کە لەڕێگای جەستەوە پەوێت شتێك فێربێت. لە نووسینێکی پلاتۆدا بەناوی *Definitiones* (414c)







ئەگەر ئێمە بایەخ بەمە بدەین لەبەرئەوەی ڕۆح لەتوانایدایە زانست وەدەستبخات بەهۆی بینینەوە، سەرەڕای ئەمەش وەك لە پێشەوە وتان گەر لە نێوان دووشتدا کە شایەنی هەڵبژاردن بێت، ئەویان کە خەسڵەتێکی بەرزتری هەیە هەڵدەبژێردرێت. ئیدی ئەنجامەکەشی شتێکە جێی ڕەتکردنەوە نییە. لە هەموو جۆرەکانی بەرهەستەکان توانای بینینە بەپلەی یەکەم دێت و لە هەمووشیان زیاتر بەبەهاترە.

## 77

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە تێگەیشتنی فەلسەفی زێتر لە توانای بینین و هەموو جۆرەکانی دیکەی بەدیکردن هەڵدەبژێردراوترە، تەنانەت لەخودی ژیان خۆشی. چونکە لەهەموویان زێتر توانای بەسەر هەقیقەتدا دەشکێت. ئەمەش هۆیەکە کەبۆچی هەموو کەسێك لەسەروو هەموو شتێکەوە بەدوای تێگەیشتنی فەلەسەفیدا وێڵە و بۆی

دەگەڕێت.[8]

## 78

ئەوانەشــی ژیــانی ڕونــاکبیری هەڵدەبــژێرن هاوکــات ژیــانێکی تایبــەت و شــیاویان هەیــە. ئەمــەش لەمــەدا دەردەکەوێت.

## 79

پێدەچـێت وشـەی "ژیـان" بـەدوو واتـا بـەکاربهێنرێت: بەواتای ڕامان و توانا وە هـەروەها بـە مانـای بـەدیهێنانیش. ئێمە لە دووحاڵەتدا دەڵێین زینـدەوەرەکان دەتـوانن ببیـنن: لـە کاتێکـدا ئەگـەر چاویان هـەبێت و هـەر لەدایکبوونـەوە توانای بینینیان هـەبێت، هاوکـات لـە کـاتێکی دیکەشـدا گـەر بەڕێکـەوت چـاویان داخـستبێت یـاخود گـەر ئـەو توانایـە

[8] بەپێی ڕستەی یەکەمی پەرتوکی میتافیزیکا واهاتووە "مـرۆڤ هـەر لەسروشـتەوە بەدوای زانستدا وێڵە". دەشێت ئەمە بەم شـێوە بخوێنرێتـەوە"هـەموو مرڤێـك هـەر لەسروشتەوە حەزی بـە فەلـسەفەیە". ئەمـەش دەشـێت وەك "ستایـشی فەلـسەفە " لێکبدرێتـەوە. بـەڕای ئەریـستۆ مـرۆڤ نـە بەتـەنها چـاوی بڕیوەتـە زانـست بـەڵکو هەتـەنگی وەدەستخـستنی زانـستێکی بەرزیـشەوەیە: Aristoteles, *Ethica Nicomachea* X, 6-8








بـەکاربهێنن و لـە شـتێك بـڕوانن. بەهـەمان شـێوەش ئەمـە ڕاسـتە بـۆ "زانـین" و "ناسـین" هەنـدێك جـار مەبەسـتمان لەمـە {کردەیـە}بـەکارهێنانی توانـاو تێڕامانـە. هەنـدێك جاریش مەبەستمان لێی هەبوونی ئەو توانایەو زانستە.[8]

## 80

ئیدی گەر ئێمە لەڕێی بەرهەستەکانەوە جیاوازیـەك لـە نێوان زینـدەوو نازینـدەدا بکـەین، وەگـەر "بەرهەسـتکردن" دوو واتای هەبێت کە یەکێکیان بـەکارهێنانی بەرهەسـتەکان دەگرێتـەوە. وە ئـەوی دیکـەش ئـەوە بگەیـەنێت کـە مـرۆڤ لەتوانایدایە سەرنجبدات (لەبەرئەوە بە کەسێکی خەوتووش دەلـێین کـە ئـەو بەرهەسـتەکانی بـەکاردەهێنێت). ئـەوە ئاشکرایە وشەی "ژیان" یش بە دوو واتا بەکاردەهێنرێت بە واتایـەك کەسـێکی ئاگـا، کەسـێکە کـە دەژی. هـەروەها کەسێکیش کەنوستوبێ ڕاستە ئەمەی پێ بووترێت: چونکە ئـەم کەسـە لـە توانـای دایـە دۆخەکـە بگۆڕێـت. وەبـەهۆی

[8] سەبارەت بەم جیاوازیە سەیر [7]Ackrill, *Aritoteles*, 198-202& Aristoteles, *De anima* II, 1(412 a 10& 22-28)& II,5

ئه‌وه‌ش ئێمه‌ ده‌ڵێین ئه‌و كه‌سه‌ به‌ئاگایه‌ كه‌ سه‌رنج و به‌رهه‌سته‌كانی به‌كاره‌، هه‌ر له‌به‌ر هه‌مان هۆش وله‌به‌رئه‌وه‌ش ده‌توانرێ بووترێ ئه‌و كه‌سه‌ ده‌ژی.

## 81

كاتێك ئێمه‌ یه‌ك یاخود هه‌مان وشه‌ به‌دوو واتا به‌كارده‌هێنین، یاخود كاتێك وه‌ك ئاماژه‌ به‌دۆخێكی پاسیڤ ده‌ده‌ین، ئه‌وساكه‌ ئێمه‌ واتایه‌كی ڕاستی و سه‌ره‌كی به‌هی یه‌كه‌م به‌كارهێنان ده‌ده‌ین: بۆنموونه‌ ئێمه‌ به‌كه‌سێك ده‌ڵێین"ئه‌زانێت" ئه‌گه‌ر زانین به‌كاربهێنێت وه‌ك له‌وه‌ی كاتێك ئه‌و هه‌ر زانستی هه‌بێت. یاخود ده‌ڵێین ئه‌و ده‌بینێت واته‌ سه‌یری شتێك ده‌كات وه‌ك له‌وه‌ی ئه‌و ته‌نها توانای سه‌یركردنی هه‌بێت.

## 82

هه‌روه‌ها ده‌رباره‌ی ئه‌و شتانه‌ی كه‌ته‌نها یه‌ك وشه‌ بۆ به‌كارهێنانی هه‌یه‌، به‌پله‌ی یه‌كه‌م ئێمه‌ ته‌نها به‌واتای زیاتریا زۆریی به‌كاری ناهێنین، به‌ڵكو ده‌ربڕینه‌كه‌ هه‌روه‌ها








به‌واتای له‌پێشترو پاشتریش به‌كاردێنین. وه‌ك چۆن ده‌ڵێی ته‌ندروستی به‌ پله‌یه‌كی به‌رز چاكه‌ {یاخود چاكتره‌} له‌وه‌ی ده‌بێته‌ هۆكاری ته‌ندروستی، هه‌روه‌ك چۆن سه‌باره‌ت به‌شتێك كه‌بۆخۆی به‌هاداره‌ و له‌ پێشتره‌ له‌وه‌ی به‌هایه‌ك ده‌ره‌خسێنێت. لێره‌دا ئێمه‌ ده‌بێت وشه‌ی "چاكه‌" كه‌ له‌ هه‌ردوو حاڵه‌تدا به‌كارهاتووه‌ و به‌ڵام یه‌ك واتای نییه‌، چونكه‌ له‌یه‌كێكیاندا سوودگه‌لێك ده‌گرێته‌وه‌، له‌ئه‌ویتریشدا واته‌ هه‌بوونی خه‌سڵه‌تێكی چاكه‌ ده‌گرێته‌وه‌.

## 83

كه‌واته‌ ئێمه‌ ده‌توانین سه‌باره‌ت به‌یه‌كێك كه‌ به‌ئاگایه‌{نه‌نوستووه‌} بڵێین ئه‌و به‌پله‌ی نایاب ده‌ژی وه‌ك له‌وه‌ی كه‌سێك كه‌خه‌وتووبێت، وه‌هه‌مان شت سه‌باره‌ت به‌یه‌كێك كه‌ به‌ڕاستی ڕۆحی خۆی به‌كاردێنێت به‌به‌راورد له‌گه‌ڵ كه‌سێك كه‌ هه‌ر ڕۆحی هه‌یه‌. به‌هۆی یه‌كه‌میانه‌وه‌{ئه‌وه‌ی ڕۆح به‌كارده‌هێنێت} ده‌توانین ئێمه‌

سەبارەت بە دووەمیشیان بڵێین کە دەژی-زیندووە-. یەکەمیان لە حاڵەتێکدایە کە چالاکە،بەڵام ئەویتر زیندووەو لەحاڵەتێکی ناچالاکدایە{پاسیڤە}.

84

ئیدی بەکارهێنانی شتێك واتە ئەمە: هەرکاتێك توانایەك هەبێت سەبارەت بە یەك شت، ئەوساکە دەبێت مرۆڤ هەر ئەوەندە بکات {کەتوانای بەسەریدا دەشکێت} بەڵام کاتێك ڕێژەیەکی زیاتر هەیە{لەتوانادا}ئەوسا شتێك دەکات کە لە هەمووی باشتربێت. بۆنموونە شمشاڵ-نای- جا کەسێك کە بیەوێت تەنها شمشاڵ بژەنێت ئەوا بەباشی دەیژەنێت. تاڕادەیەکیش هەمان شت ڕاستە لە حاڵەتەکانی دیکەدا. هەروەها دەتوانین بڵێین کەسێك شتێك بەکاردەهێنێت بەو شێوەیەی کەدەبێت، هەروەها زۆرباش بەکاریشی دێنێت، چونکە هەرکەسێك شتێك بەچاکی و ڕێکوپێکی بەکاربهێنێت، ئامانج وسروشتی ئەو شتەشی لەبەرچاوگرتووە.

85








ئیدی ئێستاکە ئەرك و فەرمانی ڕۆح لەوەدایە کە بەتایبەت یاخود بەزۆری لەبیرکردنەوە و لێکدانەوە بەکاردێت. ئەمەش بەسروشت سوك و ئاسانە بۆ هەموو کەسێك کە لێکدانەوە بکات. کەواتە کەسێك لە پلەیەکی بەرزدا دەژی ئەگەر بەڕێکی بیربکاتەوە و گەر بەتایبەت ئەمەی لە پێناو گەیشتن بە هەقیقەتدا بێت. ئا ئەمە ئەو پیاوەیە کە تێگەیشتنی هەیەو هاوکۆکە لەگەڵ زانستداو ڕێکوپێك تێڕادەمێنێت و دەهزرێت. ئیدی لەم حاڵەتەدا ژیانێکی تەواو واتادار بەو کەسانە دەبڕێت و بە ئەوکەسانەی کە تێگەیشتنی فەلسەفیان هەیە کە ئاماژەشی پێدەدرێت.

86

ئەگەر بۆ هەموو زیندەوەرێك "ژیان" یەك شت بێت لەگەڵ "هەبووندا"، ئەوە ئاشکرایە کە ئەو مرۆڤە پلەیەکی بەرزی تێگەیشتنی فەلسەفی هەیە لە ڕاسترین واتای وشەی هەبوون، وە بەتایبەت کاتێك ئەو کەسە ئەو تێگەیشتنە{یاخود ئەو هەبوونە} لە پراکتایکدا

بەجێبهێنێت و بەنیازبێت و بیەوێت تێڕامێنێ لەوەی کە زیاتر شایەنی ناسینە لەوەدا کەهەیە.

## 87

هەروەها ڕاستە کە چالاکیەکی تەواو و ناپچڕپچڕ، خۆشی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. لێرەوە چالاکی تێڕامان لە هەموو چالاکیەکانی دیکە خۆشترە.[9]

## ٨٨

سەرەڕای ئەمەش جیاوازیەك لە نێوان هەبوونی چێژو خۆشی لە کاتی خواردنەوەدا هەیە، لەگەڵ هەبوونی چێژ یاخود چێژوەرگرتن لە خواردنەوە، چونکە زۆر ڕێی تێدەچێت کە کەسێك تینوی نییە یاخود کەسێك کە شتێك قوتدەدات بەڵام حەزیشی لێ نییە، کەچی لە کاتی خواردنەوەیدا چێژی لێوەردەگرێت نەك بەهۆی خواردنەوەوەکەوە، بەڵکو بەهۆی ئەوەی ئەم بە ڕێکەوت لە شوێنێك دانیشتوە و سەیری شتێك دەکات یاخود دەبینرێت.

[9] Plato, *De Staat* 581d







ئێمە دەتوانین سەبارەت بەم کەسە بڵێین کە ساتێکی خۆش بەسەردەبات و لە کاتی خواردنەوەکەشدا خۆشی پێدەگات، بەڵام ئەمە بەهۆی ئەوەوە نییە کە دەخواتەوە یاخود بەهۆی ئەوەشەوە ئێمە کە لە خواردنەوەدا چێژوەردەگرین. بەهەمان شێوەش دەتوانین دەربارەی ڕۆیشتن و فێربوون یاخود هەر چالاکیەکی دیکە بڵێین کەخۆشە، یاخود جێی ڕەزامەندیە، نەك لەبەرئەوەی ئێمە بەڕێکەوت چێژ یاخود ئێشی لێبینین، بەڵکو ئەوەندەی هەمووومان بە ئامادەبوونی ئەم حاڵەتە چێژ یاخود ناخۆشی هەست پێ بکەین.

## ٨٩

بەهەمان شێوەش دەتوانین"ژیان" بەخۆشی ناو ببەین، ئەگەر بە ئامادەبوونی-هەبوونی- ئەو خۆشیە بۆ ئەوانەی کە ئەو جۆرە ژیانە بەسەردەبەن خۆش بێت، وە نەك بۆ ئەوانەی کە بەڕێکەوت دڵیان بەشتێك خۆشە، بەڵکو بە تەنها بۆ ئەوانەی کە ژیان خۆشیە، ئەم ناوبردنە ڕاستە، وە هەستکردن بەو دڵخۆشیە دەگەڕێتەوە بۆ خۆشی ژیان.

٩٠

ئیدی دەتوانین سەبارەت بە کەسێك کە ئاگایە بڵێین زیندووەو دەژی وەك لەوەی کە خەوتووە. هەروەها ئەوکەسەی تێگەیشتنی هەیە زیاتر دەژی وەك لەوەی کەنییەتی، ئێمە دەڵێین کە سەرچاوەی خۆشی ژیان دەگەڕێتەوە بۆ بەکارهێنانی ڕۆحی تێیدایە، چونکو ئەمەش ژێنێکی ڕاستەقینەیە.

٩١

کەواتە ئێستاکێ چەند شێوەیەکی جیاواز هەیە بۆ بەکارهێنانی ڕۆح، بەڵام گرنگترینیان ئەوەیە کە مرۆڤ بەئەندازەیەکی باش لێوەی بگاتە تێگەیشتنێکی فەلسەفی. بێگومان نکولیشی لێ ناکرێت کە خۆشی لە تێگەیشتن و تێڕامانی فەلسەفیدا تەنها یاخود بە تایبەت خۆشی ژیانە. ژیان بۆخۆشی دڵخۆشیە بەتەنها یاخود بەزۆری بۆ ئەو کەسانەیە کە فەلەسەفەکاری دەکەن. چونکە بەدیهێنانی زۆرینەی بیرکردنەوە ڕاستەکان، ئەوانەی کە بەهۆی بالآترین بنەماو پرەنسیپەوە و ئەوانەی تەواو جێگای







متمانەن لە هەموو چالاکیەکانی دیکە، زۆرترین خۆشی ژیان دەچێژن.

٩٢

﴿لێرەوە ئاشکرایە کە مرۆڤە ئاقڵمەندەکان بەهۆی ئەزموونکردنی خۆشیەکی ڕاستەقینە و خۆشیەکی بەهادارەوە دەبێت خەریکی فەلسەفەکاری بن﴾

## ژیانی ڕوناکبیری ژیانی بەختەوەری

٩٣

ئەگەر ئێمە بمانەوێت ئەم بەختەوەریە تەنها لەڕێی بەشەکانیانیەوە{پێکهێنەرەکانییەوە}لێك نەدەینەوە، بەڵکو لەڕێی بەردەوام گەڕانەوە بۆ ژیان، بگەینە هەمان دەستنیشانکردن و وەك تێکستێك وەری بگرین. ئەوا دەبێت هیچ خراپ تێنەگەیشتنێك نەهێڵینەوە دەربارەی ئەوەی کە فەلسەفەکاری لە هەمان پەیوەندیدایە بۆ ژیانی بەختەوەری وەك لەهەمان پەیوەندیشدایە لەگەڵ

سروشتماندا. گەرچی ئێمە مرۆڤێکی بەرفراوان یاخود بێ نرخیش بین. هەموو یەکێك ئەوشتانە دەدۆزێتەوە کە بەرەو ژیانێکی کامەرانی دەبات یاخود کە بەرئەنجامی کامەرانییە،ئیدی ئەو ڕێگایە ماندووبوون هەڵدەگرێت{لە پێناو گەیشتن بە کامەرانی}. سەرەڕای ئەمەش هەندێك لەو هۆکارانەی کە ژیانی ئێمە کامەران و شاد دەکەن مەرجێکی زەرورین و وە هەندێکیشیان سەرچاوەی خۆشین.

## ٩٤

ئیدی بۆچوونی ئێمە ئەوەیە کە ژیانی کامەران و بەختەوەری لە تێگەیشتنی فەلسەفیدایە یاخود لە جۆرێك لە داناییدایە، یاخود لەوەدایە کە مرۆڤ باشترین خەسڵەتی تێیدابێت، یاخود لەوەدا کە دڵخۆشی هەبێت یاخود لە هەموو ئەم شتانەدایە.

## ٩٥

دەی ئەگەر ژیانێکی بەختەوەر لە تێگەیشتنی فەلسەفیدا بێت، ئەوا ئاشکرایە ئەمە {بەختەوەریە} تەنها







بۆ ئەوانەیە کە فەلسەفەکاری دەکەن، وە ئەگەر بەختەوەری لەوەدایە کە مرۆڤ باشترین خەسڵەتەکانی ڕۆح یاخود ئەزموونکردنی خۆشی هەبێت، ئەوا ئەمە بەتەنها یاخود بەزۆری بۆ ئەوانە، چونکە هەبوونی باشترین خەسڵەت گرنگترین شتە لەوەی کەهەمانە{لەژیاندا}، وە گەورەترین سەرچاوەی خۆشیشە، گەر ئێمە یەك بەیەکی پارچەکانی سەیربکەین، کە ئەمەش {بەرهەمی} بۆخۆی تێگەیشتنێکی فەلسەفییە. هەروەها ئەگەر کەسێ لافی ئەوە لێبدات کە هەموو ئەو شتانەی بەیەکەوە ژیانێکی بەختەوەر دەرەخسێنێت، ئەوا شتێکی دیکەشی دێتە سەری کە پێناسەکەیەتی{هی بەختەوەری} لە تێگەیشتنی فەلسەفەدا.[9]

96

[9] پێدەچێت ئەریستۆ لێرەدا شوێنێ دیاربکات لەو مشتومڕەی کە لە نێوان فێرگەی پلاتۆدا هەبوو دەربارەی پەیوەستی بەختەوەری بە ژینێکی پڕ تێرامان ولێخوردبوونەوەدا: Aristoteles, *Politica* VII, 1(1323 a 14-1324 a 4).

ئەمــەش شــتێك لەگــەڵ خۆیــدا دەهێنێــت كــە هــەموو كەســێك لەتوانایدایــە بیگــاتێ{بگاتــە بەختــەوەری} بۆیــە دەبێــت ســەرقاڵی فەلــسەفە بێــت. چــونكە لەوێــدا یــاخود بەزۆری لەوێدا ژیانێكی {پڕ}تەواو هەیە، یـاخود فەلسەفە لــە هــەموو ئەگــەرەكانی تــر بــۆ بەختــەوەری لــە پێــشترە، بۆئــەوەی نــاوی یــەك هۆكــار بهێــنین: لەبەرئــەوەی بــۆ ڕۆح فەلسەفە باشترین ڕێگایە بۆ گەیشتن بە بەختەوەری.

## 97

خــراپ نییــە گــەر ئــەم خاڵە زێــتر ڕۆشــن بكەینــەوە (بــە بەراورد بەو گریمانە گشتیانەی تر) بـەهۆی ئـەو شـتەی كە لەچاوی هەموو شتێكی تردا بەڵگەنەویستە.

## 98

بەلایــەنی كەمــەوە شــتێك هەیــە كــەلای هــەموو كەســێ ئاشــكرایە كــە یــەكێ ژیــانێكی دەوڵەمەنــدو گــەورە یــاخود دەســەڵات هەڵنابــژێرێت بــەبێ بەرچــاوڕوونی یــاخود بــەبێ





فامیین و ئــەقل، تەنانــەت ئــەوە ناكات گــەر ئــەوە لــە پێنــاو دەســتكەوتێ یــا خۆشــیەكی هــەرزەیی تێیــدابێت، وەك چۆن ئەوانــەی بەهــەموو ژیانیــان ئەمــە پیــشەیانە. {ئەفــسوس} وەك دەردەكــەوێ هــەموو مرۆڤــێ هەوڵیــەتی خــۆی لەئــەو بەرچــاوڕوونییە لابــدات. ئیــدی تێگەیــشتنی فەلــسەفی لــە نــەبوونی بەرچــاوڕوونییەوە دێــت. وە مــرۆڤیش هەمیــشە یـــــەكێك لــــەو دوو دژە{فەلــــسەفە و پێـــــچەوانەكەی} هەڵدەبژێرێت و خۆی لەئەویدیكە لادەدات.

## 99

وەك چــۆن دەبیــنین كــە دەبێــت خۆمــان لەنەخۆشــی لابدەین، بەهەمان شێوەش دەبێت تەندروستی هەڵبـژێرین. كەواتـــە بـــەم لێكدانەوەیـــە بێـــت دەرئەكـــەوێت كـــە تێگەیـشتنێكی فەلـسەفیانە لـە چـاو هـەموو شـتێكدا لـە هەموویان لە پێشترەو نـەك لـە پێنـاو شـتێكی دیكەدایـە كە لێــوەی دروســتدەبێت (شــایەتحاڵی ئەمــە ئــەو بۆچــوونە باوانەی كەهـەن). ئەگـەر كەسێك خـاوەنی هـەموو شـتێك بێت، بـەڵام ناسـاغ ونـەخۆش وتوانـای تێگەیـشتنی نـەبێت،





ئەوا ژین هیچ بەهایەکی نییە بۆی، چونکە ئەو ناتوانێت هیچ قازانجێك لەو شتانە بکات.

## 100

لەبەرئەوە ئەوانەی ئاشنایەتیان لەگەڵ تێکستە فەلسەفەیەکاندا هەیەو لە توانایاندایە تامی بکەن، پێیان وایە شتەکانی دیکە هیچ واتایەکیان نییە. هەر لەبەر هەمان هۆشە کە هیچ کەسێك لە ئێمە ناتوانێت لە هەمووژیانیدا هەردەم مەست بێ یاخود هەر بەمنداڵی بمێنێتەوە.

## 101

لەبەر ئەم هۆیەشە کە خەوتن گەرچی زۆر خۆشیش بێت خوازراو نییە، تەنانەت گەر ئێمە پێمان وابێت کە کێ بخەوێت هەموو شتێکی خۆشی لایە، لەبەرئەوەی ئەو دیمەنانەی{خەونانەی} کە لە کاتی نوستندا دێنەئاراوە ڕاست نین، بەڵام ئەوەی بە ئاگایی دەبینرێت، ڕاستن. خەوتن و بە ئاگابوون لە هیچدا جیاوازیان نییە مەگەر







تەنها لەوەدا کە ڕۆح لە حاڵەتی بە ئاگاییدا بەریەك کەوتنێکی لەگەڵ ڕاستیدا هەیە {واقیع}، بەڵام لەدۆخی نوستوندا {ڕۆح} هەڵدەخەڵێت. ئەوەی لەدەمی خەونەکانماندا بەدەردەکەوێت سێبەرەو ناڕاستیشە.

## ١٠٢

هەروەها ئاشکرایە کە زۆرێك لە خەڵکی لەمەرگ هەڵدێت، ئەمەش ئەوەدەگەیەنێ {بەڵگەیە} کە ڕۆح حەزی لەفێربوونە. ڕۆح لەشتێك هەڵدێت کە نایناسێت، کە تاریك و ناڕۆشنە، بەڵام بەسروشتی خۆی بەدوای شتێکدا دەگەڕێت کە ئاشکراو ناسراوە. بەتایبەت لەبەرئەمەیە کە دەتوانین بڵێین دەبێت ئێمە ڕیزێکی تایبەتمان هەبێت بۆ ئەو کەسەی کە بەهۆیەوە خۆر وروناکی دەبینین. وە دەبێت ڕێزی دایك و باوکمان بگرین لەبەرئەوەی ئێمە قەرزاری ئەو هەموو شتە بەهادارانەین بەهۆیانەوە: چونکە ئەوانن

بەرپرسیارن لەوەی ئێمە کە بتوانین تێگەیشتمان هەبێت. لەبەر هەمان هۆ ئێمە ئەزموونی خۆشیەك دەکەین کە جێی متمانە بێت و وەهەمان شتیش ڕاستە سەبارەت بە ئەوانەی کە دەیانناسین و هاوڕێمانن. ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کە ئێمە زێتر بایەخ بە شتێك ئەدەین کە بناسرێت و ڕوون و ئاشکرابێت. وەئەگەر ئەمە بۆ ئەوە بێت{بخوات} کە ناسراوەو ڕوونە، ئەوا بۆ ئەمە بە زەروری بۆ زانست و زانین وتێگەیشتن دەخوات.

## ١٠٣

سەرەڕای ئەمانەش وەك چۆن بۆنموونە لە خاوەنداریێتیدا مرۆڤ جیاوازی لە نێوان وەدەستخستنی شتێك بۆ ژیان لەگەڵ بەختەوەری ژیاندا دەکات، بەهەمان شێوەش پێموابێ ئەمە بۆ تێگەیشتنی فەلسەفی ڕاستە. پێمواییە ئێمە بۆ ژیان تەنها شێوەیەکی دیکەمان پێویستە وەك لەوەی ژیانێکی چاکتربژین. دەبێت لەزۆربەی خەڵکی نەگرین کە کامیان پەیڕەودەکەن{واتە تەنها بۆئەوی بژین نەك بەختەوەربن}: واتە کاتێك ئەمان خوازیاری ژیانێکی








بەختەوەرن، بەڵام بە تەنها ڕازی یاخود قایل نین بە شتە سادەکان بۆ ژیان {واتە لەوەزیاتر ناگەڕێن بەدوای بەختەوەریدا} بەڵام کاتێك مرۆڤ پێی وابێت کە ژیان بەهەر نرخێك بێت دەبێت بەردەوام بێت،[9] ئەوا جێگای پێکەنین و گاڵتەجاڕیە کە ئەم کەسە خۆی ماندوو دەکات و مشوری ئەوە دەخوات کە بۆ فێربوونی فەلسەفە دابین بکات چونکە مایەی زانین و ناسینی واقیعی ڕاستەقینەیە.

## نێوانداری بەها مرۆییەکان

## ١٠٤

مرۆڤ دەتوانێت بە لێکدانەوە بەهەمان ئەنجامگیری بگات. ئەگەر تێڕامان لە ژیانی مرۆڤ بە ڕۆژی ڕووناك بێت، ئەوا مرۆڤ دەگاتە ئەو ڕاستیەی کە هەموو شتێك کەمرۆڤ بەلایەوە گرنگە گەمەی سێبەرە.[9] لێرەوە ڕاستە کە مرۆڤ

---

[9] سەیری ١١٠ و هەروەها Gorgias ١٢٠ بکە.

[9] لێرەدا بەچاولێکردن لە تێزەکەی پلاتۆ ئەریستۆ دەیەوێت بڵێت کە واقیع بۆ ئەو کەسانەی کە ئاگایان لە فەلسەفە نییە جگەلە گەمەی سێبەر بەراوردکردن هیچی

دەڵێت، ئادەمیزاد هیچ نییەو شتە مرۆییەکانیش هەتاهەتایی نین. مرۆڤ دەبێت گاڵتەی بێت بە {واتای}هێزو گەورەیی و جوانی: چونکو هیچ بەهایەکیان نییە. ئەوانە تنەنها کاریگەریان هەیە لەسەرمان{لەسەر دیدەمان} لەبەرئەوەی ئێمە ناتوانین جیاوازیەکی وردیان {لە نێواندا} بکەین.[10]

١٠٥

وەئەگەر یەکێك لە توانایدا بووبێت بیرتیژانە وەك ئەوەی لە چیرۆکی لاینسوس Lynceus کە دەیتوانی لە دیوارو نێوان درەختەکانیشەوە ببینێ، ئەوا دەشێت ئەم مرۆڤە تواناو حەوسەڵەی ڕاگیرکردنی دیدو ڕوانینی کەسێکی تری ئەگەر بتوانێت ئەو {پێکهاتەیەی} چیەتی

دیکە نییە بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی کە دەیبینن: , Aristoteles *Metaphisica*, V, 29(102 b 24)

[10] Aristotels , *Metaphisica*, II,1 (993 b 9-11)







ئەو کەرەسەی لێدروست بوو بزانێت.[9] هەروەها {واتای}ڕێزگرتن و بەناوبانگی کە زیاتر درکی پێدەکرێت{وەك لەوەی بەچاو دەیبینین} شتێکە کەپڕە لە بێ مانایی دەرنەبڕاو. کێ جارێك بزەیەکی هەتاهەتایی وەرگرێت بەلایەوە گەمژەییە کە بایەخ بەو شتانە{ناوبانگ و ڕێزدەرخستن} بدات. کام لە شتە مرۆییەکان بە هەمیشەیی و بەردەوام دەمێنێتەوە؟ نەخێر، ڕام وایە کە تەنها بەهۆی لاوازی و کورتبینییەوە ئێمە ئەو شتانە بە گرنگ دەزانین.

١٠٦

گەر مرۆڤ ئەمە بە چاوی خۆی ببینێت{تێی بگات}، کێ دەتوانێت بڵێت ئەم کەسە بەختەوەرو شادو بێ خەمە؟ هەر لە سەرەتاوە ئێمە لە سروشت بووین و بەپێی سروتە

[9] لاینسیوس یاخود lynxoog ئەفسانەیەی توانایەکی سەیری لە ویستی بینینی هەموو شتێکی نادیاردا هەبووە.

باوەکانی نمایشکردن[9] دروستکراوین بۆئەوەی سزابدرێین. بە وتەی بەساڵاچووەکان کە دەڵێن دەبێت ڕۆح سزابخوات {سزابدرێت} وە ژیانی ئێمە جۆرێکە لە سزادان لەپێناو دەستکەوتنی شتە گەورەکاندا، کە ئەمە لە ژێر کاریگەری پەیامی خوداوەیە.

### ١٠٧

هاوڕێتی ڕۆح لەگەڵ جەستەدا لە ڕاستیدا چەند ڕێگایەکی هەیە. بۆنموونە بە پێی ئەو هەواڵانەی کە لە Etrusken وەن، واباسکراوە کە زیندانییەکان لە ڕێی کۆت وبەندکردنی لاشە مردووەکەیان بە هی مرۆڤە زیندووەکانەوە ئەشکەنجەدراون، و ڕووی دەموچاویان کراونەتە یەکتر و ئەندامی لاشەیان لەسەر یەکتر دانراوە، بەهەمان شێوەش ڕۆحیش درێژکراوە و بەهەموو ئەندامە

[9] ئەریستۆ ئاماژە بەو سروتە ئاینییە دەدات کە لە هەندێك ئاینزدایە کە تێیدا بەڵێنی ژیانێکی بەختەوەر لە جیهانێکی تردا پاش مردن نمایش دەکرێت. ئیدی زگارکردنی مرۆڤ لە گوناهەکانی لە سروتێك(ڕیتوێلێکی)ی نهێنی دەچێت.








بینراوەکانی جەستەوە گرێدراوە[8].

## بڵێسەی خودا لەمرۆڤدا

### ١٠٨

هیچ شتێك بۆ مرۆڤ خودایی و پیرۆزنییە جگەلەوشتەی کە بۆ مرۆڤ شایەنی خۆماندووکردن {ڕەنجکێشان} بێت. ئەمەش ئەوشتەیە کە لەڕێی بەدیهێنانی تێگەیشتنی فەلسەفی و بیرکردنەوە چنگدەکەوێت. لەوەی کە مولکی ئێمەیە تەنها ئەوشتە نەگۆڕە{نەمرە}کە لەناو ناچێت، خوداییە.

### ١٠٩

بەهۆی ئەگەرێکەوە دەتوانین لە ژیانماندا سوود لەو توانایە وەربگرین، گەرچی ئەوە هەر لەسروشتەوە سەخت و بارگرانییە، بەلام سەرنجڕاکێشە، ئەوەش کە بەراوردکردنی مرۆڤە بە بوونەوەرەکانی تر، کە لە چاو

[8] سەیری *Phedo* 82e

**هەموویاندا مرۆڤ لە خودا دەچێت.**

**١١٠**

**"ڕۆحی ئێمە خوای ئێمەیە" ﴿جا ئەمە هێرمینمۆس وتبێتی یاخود ئەناکسۆگۆراس﴾ وە هەموو زیندەیەك كە دەمرێ بەشێك لە خوداشی تێیدایە{واتە بەشێك لە زیندوویێتی كە مانەوەی ڕۆحە هەر دەمێنێتەوە}". ئیدی دەبێت ئێمە فەلسەفەكاری بكەین یان دەبێتماڵئاوایی لە ژیان بكەین و لێی دەربچین، چونكە ئەویتر هەیە، بەڵام ئەمە یا ئاخاوتنێكی پیاوماقوڵانەیە یاخود دێوانەیەتیەكی گەورەیە.**[10]

[10] هەڵبژاردن لە نێوان ژیان و زیندوویی، زیندوویی وەك ئەویترو بەرامبەری وستوویی –نەزانی- بەڵام ژیان یەكسانە بەئامانجی فەلسەفە.



